ENDESE



چاپی چوارەم

# مێژووی کۆنی کورد

د.جەمال ڕەشید ئەحمەد ● د. فەوزی ڕەشید

وەرگێرانی: ملکۆ کەلاری



# میژووی کۆنی کورد

د.جەمال ڕەشید ئەحمەد
د. فەوزی ڕەشید

وەرگێرانی: ملکۆ کەلاری

ناوی کتێب: مێژووی کۆنی کورد
ناوی نووسەر: د. جەمال ڕەشید ئەحمەد، فەوزی ڕەشید
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ملکۆ کەلاری
بابەت: مێژوویی
نۆبەتی چاپ: پێنجەم ٢٠١٩
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٦٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٧١١)ـی ساڵی (٢٠١١)ـی پێ دراوە.

ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:
د.جمال رشيد أحمد و د.فوزي رشيد،
تأريخ الكورد القديم، أربيل، ١٩٩٠

## پێشەکی بۆ چاپە کوردییەکەی ئەم کتێبە

دوا بە دوای راگرتنی جەنگ لەگەڵ ئێراندا وبەهێرش هێنانی پیلانی ئەنفال بۆسەر دانشتوانی کوردستان ساڵی ١٩٨٨ز وزیندە بە چاڵ کردنی نزیکەی ١٨٢٠٠٠ بێتاوانی کورد لە لایەن رژێمی بەعسی عەرەبیەوە، سەردەمی پاش ئەم کارەساتە تا ساڵی ١٩٩٠ز سەردمێکی تایبەت بوو لە بەرهەڵستیکردنی دەوڵەتی عێراق دژ بە بەرژەوەندی گەلی کورد وبێ هیزکردنی بناغەکانی بزوتنەوە نیشتمانیەکەی ولەناوبردنی کولتوورو کەلەپورە نەتەوایەتیەکەی، بە تایبەت کاتێك پیاوانی لەشکری ئەم دەوڵەتە بە فەرمانی علی حسن المجید (علی کیمیاوی) دەستیانکرد بە خاپوورکردنی گوندەکان وخستنی دانشتوانەکەی یەکاویەك بە ژێر کۆنترۆلی خۆیان و، لە هەمان کاتدا سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین لە لایەن خۆیەوە خوێندنی زمانی کوردی لەم زانکۆیەدا قەدەغە کرد. ئا لەم سەردەمەدا توانیم وەزیری خوێندنی باڵا قایلبکەم بە چاپکردنی کتێبێکی عەرەبی مەنهەجی سەبارەت بە مێژووی کورد، بۆ ئەوەی لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتدا بخوێندرێت، بەڵام لە بۆ بەجیهێنانی دەبوا کەسێکی دووهەم تێیدا هاوبەشی بکردبایە. بۆ ئەو مەبەستە هەڤاڵی خۆم خاوەنی بیری ئازاد دکتۆر فەوزی رەشیدم پەسەند کرد، هەرچەندە پسپۆریەکەی دوور بوو لەم بابەتەوە، بەڵام لەبۆ جێبەجێکردنی فەرمانی یاسایی وزارەتی خوێندنی باڵا

ڕەزامەندی د. فەوزی ڕەشیدم مسۆگەر کرد ویارمەتیمدا لەو بەشەی ئەم کتێبە کە دەبوا ئەو بینوسییایە ونێوی ئەم هەڤاڵە بەڕێزەم بخستبایە سەر بەرگی کتێبەکە.

لە هەمان کاتدا وزارەتی خویندنی باڵا، بە فەرمانی تایبەت وبە بێ ڕەزامەندی من، توانی بەشێك لە وتەکانی صدام حسێن بخزێنێتە پێشەکیە عەرەبیەکەی ئەم کتێبەوە، بەڵام بە یارمەتی د. کوردستان موکریانی، وەك خاوەن ڕابووردوویەکی زانا لە کاری ڕێکخستنی لاپەڕەی کتێبدا، لە پێش چاپکردنی کتێبەکە توانی ئەو وتانە لەم پێشەکیە لابەرێت. بەم جۆرە ئەم کتێبە بووبە سێهەمین بەرهەمی گەورەی من هەر چۆنێك بێت، مەبەستی من لە دانانی ئەم کتێبە بۆ ئەوە بوو، کەوا خوێندکارانی زانکۆکانی عیراق بزانن کورد یەکێکە لە گەلە هەرە ڕەسەنەکانی وڵاتی کوردستان وتێکدانی ئەم ڕاستیەش بە هیچ جۆرێك نایەتەدی.

هەر چەندە مەرجە میللیەکانی ئەم گەلە لە چەرخی هیلینیدا (نیوەی هەزارەی یەکەمی پێش زایین) بە تەواوی لە سەرووی مێسۆپۆتامیادا سەریان هەڵدایەوە و وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ لە نووسراوەکانی دەوڵەتی ڕۆمانی بە شێوەی (کۆردوێنیّ) تۆمار دەکرا، بەڵام لە ڕاستیدا، کۆمەڵگا کۆنەکانی زاگرۆس لە هەزارەی سێیەم و دووەمی پێش زاییندا ڕۆڵێکی باڵایان هەبوو لە داڕشتنی کولتوری ئەم گەلە و ئەمرۆ لە لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی کوردەواریدا بە دیار دەکەوێت.

پێمباشبوو لێرەدا، ئاماژە بەوە بکەم، کە (ملکۆ کەلاری) ی وەرگێڕی ئەم کتێبە بە ڕەوشتی ئەدەبیانەی خۆی، داوای ڕەزامەندی منی کرد بۆ بڵاوکردنەوەی چاپی کوردی کتێبەکە، منیش وەکو دکتۆر جەمال رەشید، لە بری خۆم ودکتۆر فەوزی رەشید، لاریم نیە لە بڵاوکردنەوەی، هیواداریشم بەردەوامبێت لە خزمەتکردنی گەل و نیشتمان، نموونەشی زۆربێت.

دوکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد

پرۆفیسۆری مێژووی کۆنی رۆژهەڵات

هێرن فاین – هۆلەندا ٧ / ٥ / ٢٠١١ز

# وتەی وەرگێڕ

بیرۆکـەی وەرگێڕانـی ئـەم کتێبـە مێژووییـە بـە نرخـە، دەگەڕێتـەوە بـۆ هەستکردنمان بە ئەرکی نەتەوەیی و زانستیمان بەرامبـەر وڵات و نـەوەی نـوێی ئـەم گەلـە ستەمدیدەیە، وەك ئاشـکرایە گـەلی کـورد یەکێکە لـەو گەلانـەی بـە هەزاران ساڵ لە پێش زاینەوە دەرکەوتوون و بە قۆناغـە میژووییـە جیاجیاکانـدا لـە پـاڵ گـەل و نەتـەوەکانی دیکـەدا تێپـەڕبووە و، شارسـتانیەتەکەی لـە شارسـتانێتی زۆر لـەو گەلانـە کۆنترە، بـەلام لـە بـەر نـەبوونی هـەلی مێـژوویی گونجـاو، بـە بـەردەوامی نـاو و جوگرافیـا و مێـژووی پشـتگوێخراوە و هـەزاران جاریش هەوڵدراوە بە تەواوەتی لەناوببرێت.

ئـەم کتێبـە بـۆ مەبەسـتی خوێنـدن، لـەزانکۆکانی عێراقـدا دانـراوە، نووسەرانیشی لەو کەسانەن کە بە بـەردەوامی هـەوڵی دەرخسـتنی راسـتیەکانی بوونی گەلی کوردیان داوە، بەتایبەت دکتـۆر جـەمال رەشـید کـە هـەموو ژیـانی تەرخانکردووە بۆ خزمەتکردنی میژوو و زمـانی کـورد و، زۆربـەی بەرهەمـەکانی بـەزمانی عـەرەبی دەنووسـێت، وەکـو خـۆی دەڵـێ: ((بـۆ گـەورە عەرەبـەکان دەینووسـم، بـۆ ئـەوەی بـاش کـورد بناسـن))، منـیش پێمباشـبوو کـە گـەورەو

بچووکی کورد بە زمانی دایکی خۆی بیخوێنێتەوە بەتایبەت ئەو قوتابی و خوێندکارانەی وەکو پرۆگرام سوودی لێوەردەگرن.

لەبەر ئەوەی دکتۆر جەمال چەند زمانێکی جیهانی بەباشی دەزانێ و، لە دارشتنی زمانی عەرەبیشدا هیچی لە نووسەرە عەرەبەکان کەمترنیە، من وەکو وەرگێڕێك زۆر ماندووبووم لە وەرگێڕانی کتێبەکەیدا، چونکە لە وشەگەلی بابەتە زانستیەکاندا، تاوەکو ئێستا لە زمانی کوردیدا وەکو زمانەکانی دیکە زاراوەی گونجاو و شیاوی بۆ دانەنراوە، لەبەر ئەوەش کە وەرگێر بۆی نیە دەستکاری راستیە زانستیەکان بکات، هەوڵمداوە کە هەموو شتێ وەکو خۆی بگەیەنمە خوێنەران، هەرچەندە خودی دکتۆر جەمال پێیوتم: (( وابزانە سەرلەنوێ ئەم کتێبە دەنووسیتەوە)) سەرباری ئەوەش هیچ دەستەواژەیەکم لێنەقرتانووە، مەگەر کوردانبێتم، هەوڵیشمداوە بەزمانێکی پاراو و سادە وریگێڕمە سەر زمانی کوردی، چونکە کتێبەکە خۆی پرۆگرامی زانکۆیە و، بە پێچەوانەوە گرفت بۆ خوێندکاران دروستدەکات.

بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە، سوودم لە چەند سەرچاوەیەکی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردی وەرگرتووە، بەتایبەت فەرهەنگەکان، هەروەها سوودم لە زۆر مامۆستا و لایەن و دەزگا زانستیەکان وەرگرتووە، هەندێکیشیان زۆر ماندووبوون لەگەڵما، لەوانە، دکتۆر جەمال، دکتۆر کوردستان موکریانی، مینۆی کوریان، هەیفا خانی خیزانم، کاك جوتیار، مامۆستایانی بەشی مێژوو و بەشی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی زانکۆی سەلاحەددین و زانکۆی سلێمانی، سوپاسی هەرهەموویان دەکەم.

وەکو پرۆگرام_ وابزانم_ ئەمە یەکەم کتێبە، کە لە سەر مێژووی کۆنی کورد بە فەرمی دانرابیێ، بە داخیشەوە، سەرەڕای گرنگیەکەی، لە سالآنی رابردوودا کەسێك دەستی نەداوەتە وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی دایك، ئێمەش وەکو کۆلکە وەرگێڕیك دەستمان دایێ بۆ خزمەتی ئێوەی خوێنەر، ئاواتمان ئەوەیە بمانبەخشن لە خەوش و هەڵەکان.

ملکۆ کەلاری
٠٧٧٠١٩٠٠٠٢٠
E-mail: mlko_kalari@yahoo.com
٢٠١١/٥/٢٥

# پێشەکی نووسەران

لە سۆنگەی ستراتیژیەتی خوێندنی باڵاوە، وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی رایسپاردین بۆ نوسینی کتێبێکی پروگرامی لەسەر مێژووی کۆنی گەلی کورد، بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی وانەکانی بەشی مێژووی کۆلێژی ئاداب/زانکۆی سەلاحەددین، بابەتەکانی بخوێنرێت، بەچەشنێك لە گەڵ بابەتەکانی پرۆگرامی بەشی ناوبراودا پێکبێت، بەو پێیەش ئێمەی نوسەران ئەو بابەتانەمان لە چوار دەروازەدا داناوە و، هەر دەروازەیەك چەند بەشێکی لە خۆگرتووە.

دەروازەی یەکەم پەیوەستە بە خستنەڕووی پوختەیەك لەسەر گەلی کورد و زمان و ئەدەب و کەلتووری، پاش ئەوە خستنە روویەکی گشتی جوگرافی دێت لە سەر ناوچە کوردیەکان (کوردستان)، دواتر باس لە شێوازی ژیانی سەرەتایی ئەو ناوچانە و، ناوچە شوێنەواریە گرنگەکانی کردووە.

دەروازەی دوەمیش، قۆناغە مێژووییەکانی دانیشتوانی کۆنی کوردستان و، پەیوەندیەکانی بە مەڵبەندە شارستانیەکانی دۆڵی دووڕوبارەوە لە خۆدەگرێ، پاشان باسی ئەو گۆڕانکاریە زمانەوانی و شارستانیانە دێت، کە لەم وڵاتەدا لە هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زایندا روویداوە، کە تایبەتمەندیەکانی ئەو قۆناغە مێژووییەیان دیاریکرد، کە تیایدا بەها نەتەوەییەکانی دانیشتوانە

خۆجێییەکان و کۆچەریەکانی پێکەوە دەرخستووە و، دواتریش بۆتە بناغەیەك بۆ دەرکەوتنی بەها نەتەوەییەکانی گەلێکی جیاکار لە مێژوودا و، دواتر لە لایەن گەلە دراوسێکانەوە بە ناوی (کورد)ەوە ناسراوە.

لە دەروازەی سێیەمی ئەم کتێبەدا، باسی ناوچە کوردیەکان و هەلومەرجەکانی دەکەین لە هەزارەی یەکەمی پێش زایندا، هەروەها باسەکە بابەتی کۆچی هۆزە سکیسیەکان و، میدیەکانیش بۆ ئەم ناوچانە دەگرێتەوە، بەهەمانشێوە ئەنجامی کۆچکردنی هۆزەکان لە گۆرانکاریەکانی هەریەك لە رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك و باکووری دۆڵی دووروبار و رۆژئاوای ئێران بە شێوەیەکی گشتی دەگرێتەوە.

دەروازەی چوارەمیش تەرخانکراوە بۆ باسکردنی رەوشی کورد لە سەردەمی ئەخمینیەکان و ئەشکانیەکان و رۆمان و بێزەنتیەکان و ساسانیەکاندا، ئەنجا دەرکەوتنیان لە مێژوودا.

لەبەر ئەوەی تاوەکو ئێستا بابەتەکانی ئەم کتێبە بەپێی بابەتەکانی پرۆگرامی ناوبراو کۆنەکراوەتەوە، پێویست بوو لە سەرمان کە لێکۆڵینەوە لە چەند سەرچاوەیەکی شوێنەواری و مێژوویی و زمانەوانی کۆن و نوێدا بکەین، هەردوکمان پێمان باشبوو ئەوزانیاریانەی کە پەیوەندیان بە چەند بەشێکی کتێبەکەوە هەیە بگۆڕینەوە.دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد دەروازەی یەکەمی(بەشی یەکەم و، ئەوەی پەیوەندی هەبووە بە شێوازی ژیانی سەرەتاییەوە لە کوردستان و، نەخشی چیایی ئانوبانینی و، تۆمارەکانی پاشا خەلدیەکان، لە بەشی دووەمدا)نووسیوە، پاشان پێشەکی بۆ بەشی یەکەمی دەروازەی دووەم نووسیوە و ئەو زانیاریانەی خستۆتە سەر کە پەیوەندی بە لایەنی زمانەوانی و ئاینی و رامیاریەوە هەیە، لە گەڵ هەندێ لە رووداوە

مێژوویییەکانی ئەم بەشەدا لە سەر بابەتی لۆلۆبییەکان و گۆتیەکان و ئۆرارتیەکان، و ئەو بابەتانەشی نووسیوە کە پەیوەستن بە کاشیەکان و مانیەکان و کاردۆخیەکانەوە.هەروەها بەشی دووەمی ئەم دەروازەیەشی نووسیوە کە پەیوەندی گۆڕانکاریە زمانەوانی و شارستانیەکانی کوردستانەوە هەیە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایندا.

لە دەروازەی سێیەمیشدا دکتۆر جەمال هەریەك لە بەشی یەکەم (کوردستان لە هەزارەی یەکەمی پێش زایندا) وبەشی دووەم (سکیسەکان)ی نووسیوە، هەروەها بەشداری کردووە لە بە شی سێیەم، کە پەیوەندی بە میدیەکانەوە هەیە، بە تایبەتی ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بە لایەنە زمانەوانی و شارستانیەکانەوە هەیە، سەبارەت بە دەروازەی چوارەمیش، دکتور جەمال رەشید بەشی یەکەمی لێنووسیوە(کوردستان لە هەردوو چاخی هللینی و مەسیحیدا، هەروەها پێداچونەوەی بۆ بابەتی(کورد و دەرکەوتنیان لە مێژوودا) کردووە لە بەشی دووەمی ئەم دەروازەیەدا دکتۆر فەوزی رەشیدیش، ئەو بەشەی نووسیوە کە پەیوەستە بە ناوچە شوێنەواریەکانەوە لە بەشی دووەمی دەروازەی یەکەمدا، جگە لەو بابەتانەی کە لە سەرەوە باسکرا هەروەها هەستاوە بە نووسینی ئەو بابەتانەی پەیوەندیان هەیە بە نەتەوە دێرینەکانی کوردستانەوە لە بەشی یەکەمی دەروازەی دووەمدا.

لە دەروازەی سێیەمیشدا بابەتی بەشی یەکەمی نووسیوە، کە تایبەتە بە دەرکەوتنی میدیەکانەوە، هەروەها بەشی دووەمی دەروازەی چوارەمی لە ژێر ناونیشانی(کورد و دەرکەوتنیان لە مێژوودا)نووسیوە.

هیـوادارین، کۆششــەکەمان بۆشـاییەکی پڕکردبێتــەوە لــەو هەولآنــەی بــۆ پەرەسەندنی ئەو خوێندنانە نراوە، کە پەیوەستن بە زانسـتە مرۆڤایەتیەکانـەوە لە ولآتەکەماندا، داواکارین لە خوای گەورە کە لە پێناو خزمەتمـەتکردنی راسـتی و نیشتماندا، سەرکەوتوومانکا.

دکتۆر
جەمال رەشید ئەحمەد

دکتۆر
فەوزی رەشید

# بەشی یەکەم

## گەل و نیشتمانی کورد

### أ- گەلی کورد

کورد لە پاڵ عەرەب و تورك و فارسدا، بە یەکێك لە گەلانی خۆرئاوای کیشوەری ئاسیا دادەنرێت، هەر لە دێر زەمانەوە ئەو ناوچە شاخاوییەی، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی تورکیا و ڕۆژئاوای ئێران و باکور عێراق و سوریا کردۆتە نیشتمانێك بۆ خۆی، لە گەڵ هەبوونی شێوازی جۆرا و جۆر بۆ دەستەواژەی (کورد) لە مێژوودا، کە لەوانەیە هەندێ جار ماناو چەمکی جیاواز ببەخشێت بە بەراورد بە ئێستای، بەڵام هەر لە سەرەتای چاخی مەسیحییەوە و تاوەکو ئەمڕۆ مانای خەڵکانێك دەبەخشێت کە هەموو خەسڵەتە نەتەوەییەکانیان هەبووە، کە لەو قۆناغە مێژوویانەدا گەشەی کردووە کە ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان پێیدا تێپەڕیوە. ناوچە بەرزەکانی سەرچاوەی هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات هەر لە سەدان ساڵەوە کۆمەڵێك هۆزی لە باوەش گرتووە کە چەندین سەدەیە ئاوێتەبوونی کۆمەڵایەتی و یەکگرتوویی زمانەکەی سەلماندووە و بۆتە دروستکەری کۆڵەکەکانی گەلی کورد لە دوای ئەوەی کە گۆڕانکاری ڕواڵەتی بە سەر ناو و هۆیەکانی بژێویدا هات، لە ڕووی شارستانییەوە پەیوەست بوو بەو کاریگەرییانەی کە لە ژیانی کەلتووری و

ئاینی سەرجەم گەلانی رۆژئاوای ئاسیادا دەرکەوت، بەلأم کەم گوێدان بە دیراسە کردنی ئەم لایەنەی مێژووی کورد بوو بە هۆی ئاڵۆزبوونی دیراسەکردنی کە تا ئەمرۆکە یەکێکە لەو کێشانەی کە گرنگیی‌پێدانی مێژووناسانی وروژاندووە لە زیاتر لە نیوە سەدەیەك.

بەو پێیە، لە بواری دیراسەکردنی مێژووی کۆنی گەلی کورددا چەند گریمانە و تیۆرێکی لێوە هەڵقولاً، کە بنەماکانی رۆژ لە دوای رۆژ لە یەکتر نزیکدەبنەوە، هەر کات توێژینەوە گەشە بکات لەبوارەکانی ئاسەوار و زمان و ڕەگەزناسی لە کوردستاندا، ئەم گەشەکردنەش هێماکانی مێژووی کۆنی ئەم گەلە بە شێوەیەکی روونتر دیاریدەکات.

بەلأم رووداوەکان لە چاخەکانی ناوەراستدا مێژووەکەی لە کوردستاندا بە شێوەیەکی وردتر دەردەکەوێت بە تایبەتی دوای دەرکەوتنی مەسیحییەت لە سەر دەستی نووسەرە رۆمانیەکان. ئەنجا روونتر دەبێت لە دوای دەرکەوتنی ئیسلام، کە کورد تێیایدا رۆڵی خۆی دەبینیٚ لە پاڵپشتکردنی کۆڵەکەکانی ئاینی نویٚ لە وڵاتەکەی و لە دەرەوەیدا.

لە گەڵ مانەوەی جێدەستی ئایینە کۆنەکان، مەسیحییەت و پرەنسیپەکانی و، ئەنجا ئیسلام لە سەرەتاکانی سەردەمیاندا بە کورستاندا بە خێرایی بلأوبوونەوە. بەمشێوەیە کۆمەڵگای کوردی لە رووی کۆمەلأیەتی و شارستانی و ڕامیارییەوە تێکەڵ بوون بە خاوەنی ئەم ئایینانە، سەرباری دەرکەوتنی رێبازی سۆفیگەریی بۆ پەرستن لەم کۆمەڵگایەدا و بلأوبوونەوەی پرەنسیپەکانی لە نێو رۆڵەکانی کۆمەڵگاکانی دەوروبەری.

ئێستا کورد بە زمانێك دەدویٚ کە سەر بە کۆمەڵێکی زامانەوانیە بە جیهانی زمانە هیدۆ ئەورووپییەکان ناسراون، ئەم زمانەش سەربەخۆیەو یاسای سینتاکسی و وشەسازی تایبەت بە خۆی هەیە، بەلأم ئەبیٚ لە ناخیدا چەند

ووشـەیەکی حەشـاردابێ بگەڕێتـەوە سـەر ڕەسـەنترین ئـەو زمانانـەی کـە لـە مەڵبەندە شارستانیەتیەکانی کوردستان و دەرەوەیدا هەبووە.

ئەم زمانەش بە شێوەیەکی گشتی دەبێتە دوو دیالیکتیـك، ژوورو و خـواروو، کەلای خودی کورد بە (کرمانجی) ناوزەندە دەکرێن، لـە پـاڵ ئـەم دوو زارەشـدا هەندێ زاری گرنگی تر هەن وەکو لوڕی و گۆرانی و زازایی (دیمیلی).

زمانی کـوردی لـە عێـراق و ئێرانـدا بـە پیتـە عەرەبییـەکان دەنووسـرێن، لـە کاتێکـدا لـە تورکیـا و سـوریادا پیتـە لاتینییـەکان بـەکاردەهێنرێت، هـەروەها کیریلی (سریلی) لە یەکێتی سۆفێت، ئەم دۆخەش لـە خۆیـدا کـار دەکاتـە سـەر گەشەی زمان، ئەشبێتە کۆسپێك لە دوواندا بۆ یەکگرتنەوەی زمانی ئـەدەبی لـە کوردستان بە گشتی(١). لە گەڵ ئەوەشدا ئـەدەبی کـوردی تۆمـارکراو کـاروانی راستەقینەی خۆی لەسەدەی یازدەیەمی زایینییەوە دەسـتپێکردووە لـە (بایزیـد) و (هەکاری) و (بۆتـان)، بـە زاری کرمـانجی، ئـەنجا لـە زارەکـانی تـردا گەشـەی سـەند، ئـەوکات زۆربـەی نووسـراوی ئـەم ئەدەبـە هەڵبەسـتە شـیعر بـووە و ناوەڕۆکەکـەی جـەخت لـە سـەر بـەها بـەرزەکان و دابونـەریتی ڕەسـەنی کـورد دەکاتەوە، هەروەها بابەتە سەرەکییەکانی داستان و چیرۆك و ئەفسانە میللییـە کوردیـە ڕەسـەنەکان و غـەزەل پێکـدێنێت، ئێسـتاش ئـەم ئەدەبـە لێـوان لێـوی بابەتەکانیەتی، یەکەم شت کـە مـرۆڤ سەرسـام دەکـات لـە کـاتی دیراسـەکردنی ئەدەب لە لای کورددا زۆری هۆنراوە میللییەکانە، زۆربەی ئەو هۆنراوانەش بـاس لە شـەڕ و سەرکێشـی و خۆشەویسـتی و وەسـفی سروشـت دەکـەن. کۆمـەڵگای کوردیش چیرۆکەکان دەگوێزنەوە لە هەر جێگایەکی وڵاتەکـەیان....... داسـتان و چیرۆکی بابەتی سوارچاکی و لێهاتوی و، پیـاوەتی و جـوامێری و، لێبـوردن و تۆڵەسـەندنەوە، هـەروەها چـیرۆکی زۆری تیایـە سـەبارەت بـە نەریتـە

نەتەوەییەکان و ڕووداوە ڕاستییەکان، وەکو داستانی بەرگری لە قـەڵای (دمـدم) کە شاعەباسی سـەفەوی لـە سـەدەی حەڤدەیەمـدا داگـیری کـرد، کـە کـورد بـە خۆشەویستی و دڵگیرییـەوە گـۆرانی بـۆ دەڵـێ کـە ڕووداوی ڕاسـتەقینە لـە خـۆ دەگرێ، چەند هەوڵێك هەیـە بـۆ ئـەوەی فولکلـۆری کـوردی بخرێتـە جێگایـەکی ئەدەبی تۆمارکراوەوە بۆ ئەوەی شانۆ و ئەدەبی شـانۆیی سـوودی لێـوەربگرێ، ناوبـانگترین داسـتانیش لای کـورد، داسـتانی (مـەم و زیـن)ە کـە لـە شـیعر و پەخشـاندا هۆنراوەتـەوە لـە هـەموو جێگایـەکی کوردسـتاندا وەك گـۆرانی دەوترێنەوە(٢)، لە ڕاستیدا داستانەکان هەنـدێ کاریگـەریان هەیـە لـە نۆبـەرەی ڕۆمانە شیعر لە کوردستاندا(٣)، بەڵام هونەری شـیعر لای کـوردیش زۆر فراوانـە لە نێوانیاندا ئـەدیبان و شـاعیران دەرکـەوتن نووسـینی کـوردی بـە نرخیـان بـۆ بەجێهێشتوون و هەندێکیان بە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسیش نووسیویانە، کۆنترینیان (بابا تاهیری هەمـەدانی)ە، (١٠٣٥ –١١١٠ن) کـە هـۆنراوەی بـە زاری لـوڕی نوسـیوە ئـەنجا (عـەلی ترمـۆکی) (سـەدەی یـازدەی زاینـی) لـە ناوچـەی هەکاری کە کتێبێکی چاکی لە سەر سینتاکس و وشەکاری کـوردی نووسـیوە و، هـەواداری هونـەرە جوانـەکان بـووە و هـەروەها خولیـای وانەوتنـەوە بـووەو، هەڵبژاردەیـەك لـە هۆنراوەکـانی وەرگێردراوەتـە سـەر فەرەنسـی لەوانـە (یـەك وشـە، ڕۆڵـەکانی نیشـتیمانەکەم، ملوانکـەی یـاقوت، ئەگـەر ژیـان خـەوێك بوایـە)(٤). دواتـر شـاعیرێکی سـۆفیگەر دەرکـەوت ئـەویش شـێخ (ئەحمـەدی جـەزیری)ە، (١٤٠٧–١٤٨١)ز، لـە ناوچـەی بۆتـان دیـوانێکی هەیـە بـە نـاوی (دیـوانی جزیـری)، هـەروەها مـەلا ئەحمـەدی بـاتێ لـە(١٤٩٢ن) کۆچـی دوایکـردووەو، عـەلی حـەریری (١٤٢٦–١٤٩٥ن) و بێسـارانی (١٦٤١–١٧٠٢ن)، و نـالی (١٧٩٧–١٨٥٥ن) و سـالم (١٨٠٠–١٨٦٦ن) و مەلـەوی (١٨٠٦–١٨٨٢ن) و

کۆیی (١٨١٥–١٨٩٢ز)و کەسانی تریش، هەروەها چەند شاعیرێکی تازە هەن لە هەموو جۆرە شیعرێکا دەستیان هەبووە، لەوانە شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٥–١٩٠٩ز) و سالمی سنە (١٨٤٥–١٩٠٩ز) و مەجدی (١٨٤٩–١٩٢٥ز) و پیرەمێرد (١٨٦٨–١٩٥٠ز) و ناری (١٨٧٤–١٩٤٠ز) و زێوەر (١٨٧٥–١٩٤٨ز) و ئەحمەد موختار (١٨٩٧–١٩٣٥ز) و بێکەس (١٩٠٥–١٩٤٨ز) و کەسانی تر.(٥)

سەبارەت بە فولکلۆری میللی گەلی کورد ئەوا زۆر دەوڵەمەندە و لە رێگەی خوانبێژانەوە ئەو هۆنراوە و گۆرانیانەیان بۆ ماوەتەوە کە باس لە مێژووی رووداوە تێپەڕبووەکان دەکات و لە بیر نەکراون، ئەو رووداوانەی کە بە دوور نییە لە جێپەنجەی مرۆیی و سۆز، هەروەها رۆمانسیەتێکی روون کە چێوەی بینای چیرۆك و سیناریۆ و کۆتاییەکانی دەردەخات. هەروەها بە دوور نییە لە پیرۆز راگرتنی گیانی قارەمانی و پاڵەوانیەتی و وروژاندن.

ئاساییە ئەگەر ئەفسانە یان باسی داستانەکان جێگایەکی دیار بگرن لە ئەدەبی میللی کوردیدا، چونکە داستان هەردەم هاوشان بووە لە گەڵ ژیانی زگماکی سەرەتایی گەلانی کۆندا، ئەوانیش گەلانێکی ملکەچ بوون بۆ هێزەکانی سروشت، هەروەها داستان گونجاو بووە لە گەڵ بارو رووداوەکانی سەردەمی ئەم گەلانەدا و ئەو چەمکانەی کە باوبوون لە بارەی جنۆکەو دێوەزمە و پاڵەوانە ئەفسانەیەکان و چیرۆکە ترسناکاوی و پڕوپووچانە کە لەجیهانە نادیارەکانیەوە پێوانەی ئەندێشەی تیژ و داستانە جوانەکانی هزری و مرۆیی دەکات. ئەم چیرۆکە زارەکیانە کە زۆرجار بێ نووسەرن بە سەدان دەژمێردرێن لای کورد بابەتەکانی بە شێوەیەکی تایبەت دەربارەی خۆشەویستی و شەر و ژن و ئازایەتی و جەنگاوەر و دەرئەنجامی ناپاکی و ستەم و، باس لە ململانێی مرۆڤی کورد دەکات دژ بە کارەساتە سروشتییەکان و دژ بە داگیرکەران و

رووبەڕووبوونـــەوەی جانـــەوەرە شـــاخاوییە دڕنـــدەکان، کێشـــەکانی نـــەداری و هـــەژاری دەگێڕێتـــەوە، هـــەروەها بـــاس لـــە زوڵـــم و زۆری دەســـەڵاتدار و مـــیر و چڵێسیان دەکات، هـــەروەها لـــە خۆشەویستی نیشتیمان و کەسوکار و، هـــەموو ئـــەم چیرۆکانە دەبنـــە ئاوێنـــەی ســـەردەمەکەی، چـــەمکە رۆحییـــەکانی رابـــردوی کوردمان بۆ دەردەخات، (٦)

ئەگەر ئەو بابەتانەی پێشتر باسکراون، بە فراوانی توێژینەوەی زانستی بۆ نەکرابێت، ئەوا لایەنێکی تر هەیە رێکەوتنی لە سەر نەکراوە ئـەویش پەیوەستە بە نیشتمانی رەسەنی کوردەوە.

زۆر بـە کـەمی تـاوتوێی ئـەم خاڵـە کـراوە. لـە سـەرەتای ئـەم سـەدەیەوە رۆژهەلاتناســی رووســی (فلادیمێــر مینۆرســکی) لــەو توێژینــەوەی کــە لــە (دار المعـارف الاسـلامیە– بابـەتی کـورد)دا بلاوکراوەتـەوە هـەوڵی داوە لـە رێگـەی پەیوەندی زمـانی کوردییـەوە تیۆرێـك بسـەلمێنێت، کـە ناوەرۆکەکـەی ئەوەیـە، کورد وەك نەتەوەیەك لە رۆژهەلاتەوە هاتۆتە رۆژئاوا و ئەوان لە لایەنی شێواز و جەستەییەوە جیـاوازن لـە ناوچـەیەکەوە بـۆ ناوچـەیەکی تـر(٧). ئـەم وتەیـەش دواتر بوو بە پێوانەیەك بۆ ئەو بۆچوونانەی کە بلاوی دەکـردەوە لـەو راپۆرتـەی پێشکەش بە کۆنگرەی بیسـتەمی رۆژهەلاتناسـی کـرد کەلـە برۆکسـل (١٩٣٨ز) بەسترا، لەم راپۆرتە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کورد نەوەی ئەو میدیانەن کە لـە هەزارەی یەکەمی پـێش زایـین لـە ناوچـەی دەورووبـەری دەریـای قەزوینـەوە لـە باشوور و باکوورەوە بەرەو کوردستان کۆچییان کـردووە، ئـەنجا بلاوبونەتـەوە بـە بـاکووری میزۆپۆتامیـادا بـە شـێوەیەکی فـراوان دوای ڕووخانـدنی دەوڵـەتی ئاشوور ساڵی (٦١٢ پ.ز)(٨)، ئەگەر پابەندی راستی ئەم بۆچوونانە بین، ئـەبێ پەیوەندی نێوان کوردانی ئێستا ودانیشتوانی رەسەنی کۆنی کوردستان بـبڕین،

ئەوانــەی کــە پــێش میدیــەکان تێیــدا جێگیربــوون، هــەروەها ئــەم بۆچــوونانە پێچــەوانەی راســتی ئاوێتــەبوونی کۆچــکردووە میدیاییەکانــە بــە دانیشــتوانی ناوچەکەدا (ئەو تیۆرەی مینۆرسکی لە راپۆرتەکەیدا ئاماژەی پێیدا) ئەو دیاردە مێژوویــە نادەگمەنــەی جیهــان کــە ڕیشــەی گــەلی کــوردی ڕووان لــە بــاکوور و رۆژهەلآتی میزۆپۆتامیادا.

لەلایــەکی تــرەوە وائــەبینین کــە زۆربــەی سەرچــاوەکان کێشــەی ناولێنــانی نەتــەوەیی (کــورد) و داتاشــراوەکانی لــە مێــژوودا پەیوەســت ئەکــەن بــە نــاوی هەرێمــە جوگرافییەکانــەوە لــە کوردســتاندا، ئــەو ناوانــەی کــە نــزیکن لــە دەســتەواژەی کــورد بــە ڕوالــەت نــەك لــە ناوەڕۆکدا، چونکە دانیشــتوانی ئــەو هەرێمانەن کە لە قۆناغێکی زۆر کۆندا لــەوێ ژیــاون و زمانــەکانیان نەچــۆتە ئــەو گروپە زمانەوە کە زمانی کــوردی لــەم ســەردەمەدا بــۆی دەگەڕێتــەوە، لــە گــەڵ ئەوەشدا کورد بەم پێیــە پەیوەســت بــووە بــەو کاردۆخییانــەی کــە ســەرکردەی یۆنــانی ئێگزەنــەفۆن ســاڵی (٤٠١پ.ن) لــە کتێبەکــەی (ئــەناباز)دا باســی لێــوە کردوون.

ئەنجا پەیوەستبوو بە ناوی ناوچــەی کــردا (قــردا) و هاوشــێوەکانی لــە نــاوە تۆمارکراوەکــانی نووســینی مێخــی و ئــارامی (بــە تایبــەتی ئــەوەی کــە لــە توێژینەوەکەی درایڤەردا لــە گۆڤــاری کۆمەڵگــەی ئاســیایی شــاهانەی بەریتانیــدا J.R.A.S هاتووە لە ساڵی ١٩٢٣ن)، (٩)

لە سەر هەمان ڕێباز هەندێ کەس کریتیەکان، ئەو هۆزە ئێرانیانــەی کــە لــە گەڵ هۆزەکــانی تــر وەکــو کادوســی و میرادییەکانــدا دەگــەڕان لــە لــەوەڕگاکانی باشوور و باشــووری خۆرئــاوای دەریــای قەزوینــدا دواتــر لــە ســەردەمی هیلینــدا رووی کردۆتە ئاسیای بچووك، بە پێشینەی گەلی کوردی دەزانن.(١٠)

ئەو هۆزانــە لــە ژێــر ســەرکردایەتی مۆلـۆنی میدیـدا ســاڵی (٢٢٠پ.ن) شــەڕی کردووە دژ بە ئەنتیۆخۆسی سێیەم، ئەنجا پەیوندی کرد بە هێزەکانی ئینیـۆخی ســێیەم لــە ژێــر ئاڵاکەیــدا دژ بــە دەوڵــەتی رۆمــانی شــەریکرد کــە ئــەوکات مەبەستیبوو دەست بەسەر ئاسیادا بگرێت، دواتر بەشدار بـوو لـە شـەرێك نزیـك مــەجنیزیا لــە ســەر رووبــاری (ســیبلیۆس). هــەروەها ئــەم هۆزانــە لــە ســاڵی (١٧١پ.ن) یارمــەتی ئۆمینیســی دووەم. Aumenes پادشــای بیرجامونیــان داوە لە شەرەکانی لە کالینیکۆس.((١١))

سەرەرای ئەمانــە، بۆچــوونی تــر هەیــە رەســەن و نــەژادی کــورد پەیوەســت دەکات بە گەلانی دێرینی دەشتەکانی بـاکوورەوە ( Proto-nordic Stepp folk) بــەلام کەوتبونــە ژێــر کاریگــەریی نــەریتی ئەرمــەنی و، خــووی نــەژادی دەریـای ناوەراسـتیان گرتبـوو، ئـەوان بـە شـێوەیەکی گشـتی بـە گـوێرەی ئـەم بۆچوونانە دەموچاوێکی باریك و چەناگەیەکی بەهێز و کەڵەگەد بوون، لە لایـەنی پێستیشــەوە کــوردە رۆژئاواییــەکان ســپی تــر و کــاڵترن لــەو رۆژهەلاتیانــەی بــە ئەسمەر تر دەردەکەون.(١٢)

بــە هــەرحاڵ نــاوی ولاتــی (کــوردۆیین و کوردۆیینــا) لــە گــەڵ شــارە بــە ناوبانگەکانی (ساریسا و ساتالکاو بیناکا) کە دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە لـە کوردســتان، هەواڵــەکانی لــە جوگرافیــای ســترابۆی یۆنانیــدا تۆمــارکراوە لــە (سەدەی یەکەمی پێش زاینی)(١٣)، بێگومان کـە ناوەکـە جووتـە لـە گـەڵ ئـەو نــاوەی لــە ســەردەمی ســلجوقی دا، لــە شــێوەی کوردســتان نوێکراوەتــەوە سەرەڕای بوونی تیۆری جیاجیا لە بارەی لایەنە جیاکانی ژیـانی گـەلی کـوردەوە بە شێوەیەکی گشتی و ئەو مێژووەی کە لە لاپەڕەکانی دیکەدا دەردەکەوێت.

## ب _ نيشتمانی كورد ( كوردستان )

ناوچــه بــەرزەكانی بــاكوور و ڕۆژهــەلاتی میزۆپۆتامیــا بــە نیشــتمانی ڕاستەقینەی كورد دادەنرێت. ئەم خاكی كوردە دەكەوێتە ناوچەیەكەوە بە سروشتێكی شاخاوی جیادەكرێتەوە، هەرێمەكانی لە مێژووی كۆندا بە ناوی جۆراوجۆر ناوبانگی هەیە وەكو (سوبیر– سۆبارتۆ– گۆتیوم–زاموا– عالیاتم– كوهسـتان– ولاّتـی شـاخ) بەلاّم لە سەدەی دوازدەی زاینییەوە بە ناوی (كوردسـتان)ەوە ناسـراوە، هەر بەم ناوەش تۆماركراوە لە كتێبی (نزهە القلوب)ی (حمدالله المستوفی القزوینی) بە گوێرەی قسەی ئەو لە (١٦) ویلایەت پێكهاتبوو و مەڵبەندەكەی قەلاّی (بەهار)ی باكووری شاری هەمەدان بووە. كە هاوسنوور بوو لە گەڵ ویلایەتەكانی عێراقی عەرەبی و خوزستان و عێراقی فارسی و ئازربایجان و دیاربەكر(ناوچە كوردییەكان –ولاّتی كوردوێنی– كە نەكەوتۆتە فەرمانڕەوایی كوردستانەوە لە سەردەمی سلجوقی)دا درەنگانێك گەریدەی توركی (ئەولیا چەلەبی) (سیاحەتنامە، بەشی چوارەم) دوای گەرانی لە سەدەی حەڤدەیەم بە هەموو ناوچەكانیدا و هەستا بە فراوانكردنی چەمكی كوردستان، وتی ویلایەتەكانی ئەرزەڕووم و وان و هەكاری و دیار بەكر و جزیرە و ئامێدی و موسڵ و شارەزوور و ئەردەلاّن بە هەموویانەوە ئەو كوردستانە پێكدێنن كە بۆ برینی ١٧ ڕۆژ دەخایەنێت(١٥)، پێدەچێ قسەكانی ئەم گەریدە چالاكە لە كاتێكدا بووبێ كە تیایدا چەمكی كوردستان لە تەنها مانایەكی ڕامیاری كارگێڕییەوە گۆڕابێت بۆ چەمكێكی نەتەوەیی، بۆیە بەم پێیە وا ئەبینین خەڵك ئەم ناوە بەكاردەهێنن بگرە لە دەرەوەی ئەم ناوچانە و دوور لە نیشتمانی كوردیشەوە، بەو ناوچانەش دەوترێت كە گروپە كوردییەكانی خوراسانی تێدا دەژین (بە تایبەت ناوچەكانی قوچان، شێروان، سەبزەوار،

بیرچـەند، بوچـنورد) و ناوچـەکانی دەوروبـەری شـاری مەشـهەد، ئـەم هـەموو ناوچانە لە ئێران و ئەفغانستان و ناوەڕاستی ئاسیادا لـە سـەردەمی (نادرشـا)دا بە ناوی کوردستان ناسراوە.(١٦)

کوردستانی ئەمڕۆ خاکێك پێك ناهێنێت کە سنوورێکی ڕامیاری دیاری کـراوی هـەبێت و دانـی پیابنرێـت، بـەڵکو بەشـێك لـە خـاکی ولأتـانی تورکیـا و ئێـران و عێراق و سوریا پێك دێنێت، لە ناوەڕاستی سییەکانی ئەم سـەدەیەوە بـە کـەمی ئـەم ناولێنانـە مێژووییـە لـە نەخشـە و ئەتڵەسـە جوگرافیەکانـدا بـەکاردێت، عێـراقیش لـە نێـوان ئـەو ولأتانـەدا کـوردی تیـا دەژی، عێـراق بـە تاکـە ولأت دادەنرێت کە بە فەرمی دانی بە ناوی کوردسـتاندا نـاوە، کـەمانای ئـەو ناوچـانە دەبەخشـێت ئۆتۆنۆمییـان هەیـە، بـەلأم ئێرانییـەکان بـە فـەرمی ئـەم نـاوە بـەکارناهێنن تـەنها لـە هـەرێمی (سـنە) نـەبێت بـەدەر لـە ناوچـەکانی دیکـەی کورستانی ئێران. لە تورکیا و سوریاش بە فەرمی دان بەم ناوەدا نانرێت.

سـەبارەت بـە سـنووری نەتـەوەیی کوردسـتانیش ئـەوا جیـاوازی هەیـە لـە بۆچـوونەکاندا، (دائـره المعـارف الاسـلامیه) باسـی لـەوە کـردووە کـە خـاکێکی لاکێشـە لـە لوڕسـتانەوە درێـژ دەبێتـەوە لـە لای باشـووری ڕۆژهـەلأتی شـاری (مەلاتی)وە بە لای باکووری ڕۆژئاوادا، درێژیەکەی نزیکـەی ٦٠٠ میـل دەبێـت و، پانێکەشـی لـە نێـوان ١٢٠ و ١٥٠ میـل دایـە، بەمـەش ئـەم سەرچـاوەیە ناوچـە لوڕییـەکان لـە کوردسـتان جیـاکردەوە(١٧). ئەگـەر ڕۆژهەلأتناسـی ڕووسـی (ڤلادیمێـر مینۆرسـکی) لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتدا ئامـاژەی بـەوەداوە کـە کوردەکـان لـە سـەر خـاکێکی بـەرین دەژیـن لـە سـنورەکانی هـەردوو دەوڵـەتی عوسمانی و ئێرانی لە شارۆچکەی (مەندەلی) تاوەکو شـاخەکانی (ئـارارات) و لـە گەڵ ئەرمەنەکاندا لە زنجیرە چیاکانی ئـەرمینیادا دەژیـن و سـنووری باکووریـان

له توركيا كۆتايی پێدێت له تەنيشت (ئەرزرووم)ەوە لـه رۆژئاواشـەوە سـنوريان رووباری (قەرەسۆ)یه که یەکێکه له زێکانی رووباری فورات(١٨)، ئەوا گرانییـەك هەیـه لـه دیـاریکردنی هێڵـی سـنووری ئـەم ولاتـەدا لـه قۆناغـه مێژووییەکانـدا، لۆسترنگ له کتێبی (بلدان الخلافه الشرقيه ص١٩٢) ئامـاژه بـەوه دەکـات کـەوا هـەرێمی کوردسـتان لـه سـەردەمی سـەلجوقییەکاندا ئـەم شـارانەی دەگرتـەوە، (کرماشان، حەلوان، چەمچەماڵ، ئالیشتار، کینگـەوەر، دەینـەوەر، شـارەزوور و بەهار)، بەلاّم له راستیدا ئـەم ناوانـه تـەنها نـاوی هەشـت ویلایـەتن لـەو شـازده ویلایەتەی مستەوفی لقەزوینی له (نزهـة القلـوب)دا باسـی کـردوون، ئەگـەر چـی ئەم ناوەش له هەرێمی (دەرسیم) نرابێت به تایبەت له سەردەمی مـیری کـوردی شـەرەفخانی بەدلیسـی خـاوەن کتێبـی (شـەرەفنامه ١٥٩٦) کەچـی لـه رووی کارگێڕییەوه و پێش شەری (ترك – رووس) (شەری قرم) یەك شاری پاشـایەتی پێکدەهێنا له لیواکانی (وان، هەکاری، بایەزد، موسڵ)، له خۆدەگرت دوای ئـەم جەنگەش ناوچەی کوردستان له ڕووی کارگێڕییەوه تەسکبووەوە و کەوته سـەر پاشایەتی ئەرزرووم.(١٩)

بەلاّم له دوای جەنگی جیهانی یەکەم ناوچـه کوردییـەکان دابەشـبوون بـه سـەر ئـەو ولاّتانـەی لـه رۆژئـاوای ئاسـیادا دروسـتبوون بـۆ هـەر بەشـێك کەوتـه ئـەو بارودۆخـه تایبەتییـەوه کـه گەشـەی رامیـاری و ئـابووری و کۆمەلاّیـەتی لـەو ولاّتانەدا دیاریکرد، وایلێهات که ئاستەم بێـت بیرۆکەیـەکی ورد بـدرێت لـه سـەر روپێویی گشتی کوردستان، بەلاّم دەتوانرێت ئەو شارو شارۆچـکانه بناسـرێتەوه که کـوردی تێـدا دەژی، لـه تورکیـادا و لـه دوای دروسـتبوونی رژێمـی کۆمـاریی تیایـدا و زۆرینـەی راگواسـتنی ژمارەیـەکی زۆر لـه کوردەکـان بـەره و ئـەنازۆڵ. کەچی ئەو ناوچـانەی بـه دۆڵـی رووبـاری (یەرشـیل تێرمـاق) دەسـتپێدەکات لـه رۆژهـەلاّت و دەوروبـەری شـاری ئـەرز ڕۆم و فـارس لـه بـاکوورەوه تـاوەکو

سنورەکانی تورکیا و سوریا لە باشوور بە کوردێتی مانەوە سەرەڕای بوونی تورکەکان لە شارە گەورەکان و پۆستە گرنگەکانیان لە دەزگا جۆراو جۆرەکانی دەوڵەتەدا.

ئەو ناوچانەی کە بە سنووری ئێراندا درێژ دەبوونەوە لە سەر ئەو دۆخە مایەوە، وەکو رۆژانی رابردوو مەڵبەندی گردبوونەوەی کوردبوون، ئەوەش هەر لە سنوورەکانی شۆفێتەوە تاوەکو خاڵی بە یەککەیشتنی سنورەکانی ئێراق-ئێران لە رۆژئاوای شاری (شنۆ)، ئەنجا ئەم سنوورە بە درێژایی سنووری نێوان عێراق و ئێران درێژەی هەیە، هەتاوەکو بەرەو باشوور بچین لە دوای خانەقینەوە ناوچە کوردییەکانی لای عێراق تەسك دەبنەوە و لە بەرامبەریشدا لای ئێرانەوە پان دەبنەوە، کە بەرامبەرە بە ناوچە کوردییەکانی لوڕدستان کە لە ئێراندا بە (پشتکۆ) ناسراوە لە سنووری هەردوو پارێزگای واست و میسان لە رۆژهەلاتەوە.(٢٠)

ناوبانگترین ویلایەت کە سیمای کوردی بەسەردا زاڵە لە توریای ئیستادا (جولەمێرگ، وان، بایەیزد، قارس، ئەزڕوم، تبلیس، سوعرەت، ماردین، دیاربەکر، مەلاتیێ، عەزیز "زەبك"، ئازەربایجان، سیواس، مەرعش) و شوێنی تر، بەلأم لە ئێراندا پارێزگاکانی (ماکۆ، خوی، سلماس، دیلمان، میاندواو، مەهاباد، شنۆ، لاهیجان، سەقز، سنە، کرماشان) و شوێنانەکانی تریش کە زۆرینەی کوردی تیادەژین لە عێراقیشدا جگە لە پارێزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان (سلێمانی، هەولێر، دهۆك)، کورد لە هەریەك لە ناوچەکانی ئاکرێ و شەنگال و دوزخورماتوو و کفری و خانەقین و پارێزگای کەرکووك ئەژین.

بەمشێوەیە دەتوانین بڵێین هەموو ئەم ناوچانە دەکەونە نێوان هێڵی پانی (٣٠-٤٠) بەرەو رۆژهەلأت و (٣٧-٤٨) بەرەو رۆژئاوا، ولأتێکی شاخاوییە کەشوهەوای لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە، بەرزترین شاخ تیایدا شاخی ئارارات (لوتکەی ئاگری)یە بەرزێکەی دەگاتە (٥، ١٥٨م)، ئێنجا شاخی

رەشكۆ لە ناوچەی (جیلوداغ ٤١٦٨م)ەو (ئاكرێی بچووك) بەرزییەكەی ٣٩٢٥م، بە شێوەیەكی گشتی بەرزی كوردستان بە تێكڕایی دەكاتە ١٠٠٠-١٥٠٠م لە سەر ئاستی دەریاوە.(٢١)

بەڵام لە دەشتەكانی ئەم ناوچانەدا كەشوهەوا نیمچە ئیستیوائیە، رێژەی باران بارین ساڵانە دەگاتە (٢٠٠-٤٠٠ملم) لە ناوچە نزمەكانی گەمارۆدراوی نێوان زنجیرەچیاكاندا رێژەی ساڵانەی دەگاتە ٧٠٠-٢٠٠٠ملم، لەوانەیە هەندێ جار بگاتە ٣٠٠٠ملم، بەڵام لە دۆڵەكانی ناوەڕاستدا كەشوهەوای تارادەیەك كیشوەرییە، لەوانەشە هەندێ جار وشك بێت، رێژەی باران بارینی ساڵانە دەگاتە ٣٠٠-٥٠٠ملم، تێبینی ئەوەش دەكرێ جیاوازی نێوان نزمترین و بەرزترین پلەی گەرمی زۆرە.

زۆربەی ناوچە كوردییەكان سەرچاوەی ئاوی زۆریان هەیە، جگە لە هەندێ ناوچە كە كەوتوونەتە عێراق و سوریا و هاوسنووری بیابانن، نەك هەر پێویستی بە ئاوە بۆ ئاودێری بەڵكو بۆ بەكارهێنانی ماڵەوەش، لە چیاكانی كوردستانەوە چوار رووباری گەورە سەرچاوە دەگرن ئەوانەش (ئاراس، قیزەل، ئۆزان)ە كە دەڕژێنە دەریای قەزوینەوە، پاشان دیجلەو فورات. رووباری بە ناوبانگی دیكەش هەیە بە دوورییەكی زۆر لە كوردستانەوە سەرچاوە دەگرن لەوانە هەردوو زێی گەورە و بچووك و هەردوو رووباری بەتلیس و بۆتان پاشان سیروان و گامەسیاو و جاگاتۆ و هی تر.

لە پاڵ ئەو كۆسپانەی كە رێگرن لە بەردەم دیاریكردنی سنووری نەتەوەیی كوردستاندا ئەوا كۆسپێكی گەورەتر هەیە لە دیاریكردنی ژمارەی دانیشتوانەكەی، بۆیە سەرچاوەی جۆراو جۆر هەن كە تا رادەیەك ژمارەی ناوردكار بە دەستەوە دەدەن. زۆربەی سەرچاوە بیانییەكان ژمارەی كوردەكان بە ٧-١٠ ملیۆن مەزندە دەكەن، لە كاتێكدا كوردەكان خۆیان سەرژمێرییان لەوە بە زیاتر دەزانن تا دەگاتە ١٥-٢٠ ملیۆن، ئەمە سەرەڕای ئەو كوردانەی

له دەرەوەی کوردستان دەژین کەژمارەیان نزیکەی دوو ملیۆن دەبێت.

له راستیدا تاکی کورد ٨٥٪ ژمارەی دانیشتوانی کوردستان پێکدێنن، ئەوانەی تریش لە تورك و ئازربایجانی و تورکمان و ئاشووری و ئەرمەن و عەرەب پێکدێن، زۆربەی کوردەکان لە گوندەکاندا دەژین و کەمیشیان لە شارەکاندا، بەلاّم جموجولێکی فراوانخوازی لە شارە کوردییەکاندا هەیە لە سەر شێوازی شاری ئەو ولاّتانەی کورد تیایدا گوزەرانی کردووە.

# بەشی دووەم

# شێوازی ژیانی سەرەتایی لە کوردستان و گرنگترین شوێنەوارەکانی

## ١- ژیانی سەرەتایی لە کوردستاندا

پشکنینە جۆلۆجی و شوێنەواریە جۆراو جۆرەکانی ناوچە کوردییەکان بەوەی گەیاندووین کە تێیدا هەندێ لە راستییەکانی ژیانی سەرەتایی بزانین. توێژینەوە جیۆلۆجییەکانی ئەوێ سەلماندویەتی کەشاخەکانی وردە وردە لە دوای دەرکەوتنی جوڵەی شاخە پێچاوپێچەکان پێکهاتووە بەهۆی پێکدادانی پلێتە کشوەرییەکان بە یەکدا، کە بە (جوڵەی پێچاوپێچی ئەلپی)(١)، دەناسرێت دەکراوە، ئەم جوڵەیەش لەسەردەمی سێیەمی دەمی ژیانی نوێ (تریتسیر)دا بووە، هاوکات لە گەڵ ئەم جوڵەشدا شوێنی چالاکی بوومەلەرزە و گڕکان چ لە کوردستان یان لە ناوچەکانی دیکە روویداوە(٢). بنیادی شاخەکانی کوردستان و زاگرۆس لە سەردەمێکدا تەواو بووە، کە پێی دەوترێت (پلیۆسین) دوای ئەوەی کە زنجیرەکانی باکوور لە گەڵ شاخەکانی تۆرۆس لە سەردەمی (میۆسین)دا تەواو بوبوو، بەلاّم ناوچە بەرزونزمیە دەشتیەکان باشوور لە سەدەمی (بلایستۆسی)دا دەرکەوتووە(٣)، هەندێك لە زاناکان لە بابەتی

داماڵینی بەفری شەخەكانی كوردستان كۆڵیوەتەوە، كە دۆڵی هەندێك لەو شاخانە پڕن لە بەفری كەڵەكەبوو لە گەڵ چاڵەبەفرینی سەردەمی (پلایستۆسین).(٤)

بەهەرحاڵ تیۆری كەش و هەوا وەلاّمدانەوەی كێشە تایبەتییەكانی كەش و هەوای سەردەمی بلایستۆسینی لە كوردستاندا نەكردۆتە مەرجێك، ئەم وەلاّمانە تەنها لەو بەڵگانەوە دێت كە لە ڕێی لێكۆڵینەوەی مەیدانی لە كێڵگەكانی جیۆلۆجیا و پالیۆنتۆلوجیا و مێژووی دیاریكراوی مادە ڕەقبوەكانەوە بە دەستدێن كە هەریەك لە توێژەران (دۆرش كارود) و (رالف سولیكی) لە كوردستاندا دەستیان پێكرد.

لە راستیدا كارود توێژینەوەكانی لە ساڵی ١٩٢٨ لە ناوچەی سلێمانی دەستپێكرد و سەردانی هەردوو ئەشكەوتی بە ناوبانگی (زرزیّ) و (هەزار مێرد)ی كرد. لە ئەشكەوتی یەكەمدا كە دەكەوێتە نزیك شارەدێی سورداشەوە چەند شوێنەوارێكی دۆزییەوە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی كۆنی سەروو، ئەو كەرەستانەش كە تیایدا بەدیدەكرا لەو جۆرە بووە كە بە (مایكرۆلیت) ناسراوە و نیشانەكانی ئاماژە بەوە دەكەن كە دەگەڕێنەوە بۆ چاخی بەردینی ناوەراست كە تاوەكو ١٢٠ هەزار ساڵ پ.ز درێژبووەتەوە.

بەلاّم ئەشكەوتی هەزار مێرد كە دەكەوێتە دووری ١٢كم رۆژئاوای سلێمانییەوە (سپایزەر) سەردانی كردووە بە بیّ ئەوەی هیچ پشكنینێكی شوێنەواری بۆ بكات، بەلاّم كاروود لە دوای ئەو بەو كارە هەستاوە.

شوێنەكە لەشەش ئەشكەوت پێكدێت كە لە تەنیشتی یەكترەوەن و یەكێك لە ئەشكەوتەكان گەورەیە و لە دوورەوە بەدیدەكرێت. لە كاتی پشكنینەكاندا لێرەدا چەند كەرەستەو ئامێرێكی بەردین دۆزرایەوە لەسەردەمی

(موستیری)ەوە (پێش نزیکەی ٥٠ هەزار ساڵ) هاوشێوەی ئەوانەن کە دواتر لە ئەشکەوتی شانیدەری سەر بە پارێزگای هەولێر دۆزراونەتەوە. بە هەرحاڵ لە هەریەك لە ئەشکەوتی زرزیّ و هەزار مێردا هیچ ئێسمە پەیکەرێکی مرۆڤی کۆن نەدۆزراوەتەوە.

بە گشتی شوێنەوارناسان نەیانتوانی لە کوردستاندا کەرەستەی چاخی بەردینی خوارووو بدۆزنەوە بێجگە لە چەن هەڵگیراوەیەکی رووکەش کە گومان هەیە لە گەرانەوەی بۆ یەکێك لە رۆڵە دیارەکانی ئەم چاخە، لەوانەش ئەو کەرەستە بەردینانەی کە لە شوێنەواری (بەردە بەلەك) ساڵی ١٩٤٩ دۆزراونەتەوە، ئەو شوێنە لە رووتایەك و لە سەر کەلاتێکی تەختە، کە دەکەوێتە دووری ٣کم باکووری رۆژهەلاتی چەمچەماڵەوە لە نێوان هەردووشاری کەرکووك و سلێمانی دا، تەپەی شوێنەکەش پێکهاتووە لە چینێك کلسی نیشتووی سەردەمی بلایستوسینی نیشتووی سەر بەردی سەردەمی میوسین.

لە دوای هەوڵەکانی توێژەر کاروود لە بەردە بەلەك پشکنینی دیکەش ئەنجامدرا لە لایەن هەردوو ئەمریکی (هاری رایت و بروس هاو)ە وە لە ئەندامانی ناردەی کۆلێنی چەرموو، چەند شوێنەوارێکیان دۆزییەوە کە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی موستیری ئەوانیش کەرەستەی بەردی سوانن لە پاچی دەستی شێوەدڵ یان بادەم پێکدێت، هەروەها (توێکەر) کە لە توێژاڵی بەردی سوان دروستکراون، هەروەها چەند کەرەستەیەکی کوچکینی تیادا دۆزراونەتەوە لە بەردی کلسی دروستکراون و خڕکراونەتەوە ئنجا دوو چینە توێژەڵیان زیاتری لێهەڵگیراوە و لە توێکردن بەکاردێت(٥). شایانی باسە لێرەدا کە کەرەستەی سوانی ورد بە جۆرە جیاوازەکانیەوە لە توێکەری ئاسایی لە پارچە سوانێك دروستکراون هیچ شێوەیەکی نییە، هەروەها لە پەلاشە، کە بە

لێوارەکانیـەوە هـیچ نیشـانەیەکی بـەکارهێنیان دەرناکـەوێت، سـەبارەت بـە (لب)یش ئەوا چەند جۆرێکە شێوەی خـر و فـرە دەم و زۆربـەی ئـەم جۆرانـەش قەبارە ناوەند و بچووکن، بەلاّم پاچ دەستیەکان هەندێکیان لە پەلاّشەی گـەورە دروستکراون هەندێك نەبێت لە پاچی ورد و باش دروستکراو و هەندێکی زۆریـش لە پارچەی گەورە و قورس بە سادەیی دورستکراون لە سەرەتاشدا لـە شـێوەی دلّ یان بادەم بووە.

بە گشتی زۆربەی پیسەسازییە سەرەتاییەکان لەم شـوێنەدا لـە یـەك دەچـن بۆ نموونە کەرەستەکانی سەردەمی موستیری کـە لـە چـینی (d) دۆزراونەتـەوە لە ئەشکەوتی شانەدەر لە شێوازی ئەو کەرەستانەن کە لە هەزار مێرد لە چـینی (c)دا بینراوە.

هەروها ئەوانەی لە بەردەبەڵەکە دۆزراوەتـەوە شـوێنەواری ئەشـکەوتی گلّـی سوور نزیك بێستوون لە کورستانی ئێران.(٦)

سەرەڕای ئەو کەرەستانەی کە لەوشوێنە دۆزراونەتەوە کە پێشتر باسـکران، پاشماوەی ئێسکی ئاژەڵی تیا بینراوە کە بە پلەی یەکەم پێکهـاتووە لـە ددان و پەلاّشـەی ئێسـکی ئـاژەڵی کێـوی وەك گـای کێـوی و کـەرەکێوی هـەروەها ئـەو فیلەی کە لە هندستان ژیاوە. هەروەها هەندێ نزیکبوونەوە هەیە لـە نێـوان ئـەو ئامێرانـەی لـە کوردسـتان دۆزراونەتـەوە و ئەوانـەی کـە لـە هـەمان کاتـدا لـە هیندستان و ناوەراستی کیشوەری ئاسیادا دەرهێنراون، بـە هـەرحاڵ پشـکنینی تریش کراوە لە شوێنەکانی تری کورستاندا، سەرەڕای هەڵکۆڵینەکەی بالی کـورە و بێخاڵ و براك و شنگال و شوێنەکانی تری کورستانی عێراق، ئەو پشـکنینانەی کـە لـە دەسـتە ئەشـکەوتەکانی شـاخەکانی زاگـرۆس لـە نـاو ئێرانـدا کـراون، شوێنانی هاوشێوەی شوێنەوارەکانی عێراق دەرخستووە بە تایبـەت ئەشـکەوتی

(تەنگ بەهدا) لە شاخەکانی بەختیاری بەرەو باکووری ڕۆژهەڵاتی شوشتر کە بە شێوەیەکی فراوان لە ساڵی ١٩٤٩ز هەڵکۆڵینی بۆ کراوە، لە کوردستانی باکووریشدا چەند نموونەیەك لە کەرەستەکانی چاخی بەردینی کۆن (پالیۆلیت) دۆزراونەتەوە بە تایبەتی لە (نمرود داغ) لە ڕۆژئاوای دەریاچەی (وان) هەروەها لە ناوچەکانی هەکاری و وان و قاریش چەند کەرەستەیەك دۆزراونەتەوە کەلە بەردی ئۆپسیدی دروستکراون و هاوشێوەی ئەوانەن کەلە چینی سێیەمی (C) ئەشکەوتی شانیدەر لە شاخەکانی برادۆست لە کوردستانی عێراق دۆزراونەتەوە.(٧)

ئەشکەوتی شانیدەر دەکەوێتە بەرزی ٦٧٠م لەشانی دۆڵەکەوە، بەلاَم شیوێنە کراوەکە ئەکەوێتە سەر ڕێڕەوێکی ڕووبارییەوە لە خوارییەوە بە بەرزی ٤٢٥مەتر، پاشماوەی ئەو ئاژەڵە شیر دەرانەی کە دۆزراونەتەوە لە چینە خاکییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتی موستێری کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ٥٠٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر بۆ پێش چاخی بەردینی نوێ لە نزیکەی ١٠٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر. (٨)

لە کوردستانی ئێرانیشدا پشکنینەکان بوون بە بەڵگەیەك بۆ بەدواداچوونی کەش و هەوا لە چاخی ناوبراودا ئەوەش بە کۆڵینەوە لە هەلاَڵەی نیشتووە ئەندامییەکان(٩)، بە گشتی ئەشکەوتەکانی کوردستان پاشماوەی شارستانیەتی ڕاوکردن تێدایە کە لە چاخی بەردینی کۆندا باوبوو، زاڵبوونی مرۆڤی ئەم سەردەمەو نەوەکانی بە سەر ژینگەی سروشتیدا بەشتێکی نامۆ ناژمێردرێت، ئەنجا دۆزینەوەی شوێنەواری کشتوکاڵی سەرەتایی و ژیانی ڕووەکی لە گرد و دۆڵە ناوخۆییەکان و لە قەتپاڵی شاخەکاندا دۆزرایەوە و لە بە

گوێرەی بەکارهێنانی ڕێگەی تاقیکردنـەوە بـەکاربۆنی ١٤، ئـەم گۆڕانکارییـە لـە ژیانی ئابووریدا پێش نزیکەی ٩-١١ هەزار ساڵ لێرەدا ڕوویداوە.

بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە ژیانەوە هەبێت لەو قۆناغە ڕاگوزەریانـەوە کـە بە چاخی بەردینی ناوەڕاست ناسراوە، ئەوا ئەو کەرەستەو ئامێرانـە دەرینـوێنیٚ کە لە شوێنە جیاجیاکانی وەك کەریم شار و ملفعات و کوردچـای و شـوێنانی تـر دۆزراونەتـەوە. سـیمای ژیـان لـە قۆناغـە دواییـەکانی چـاخی بـەردینی کـۆن و ماوەی ڕاگوزەری ئاماژە دەکات بـە چـاخی بـەرینی ناوەڕاسـت و لەوێشـەوە بـە چـاخی بـەردینی نـویٚ و دورسـتبوونی کۆمـەڵگای کشـتوکاڵی و کـورتی زەمـەن بەگەڕانـەوەی بـۆ چـاخی کـۆن. ئـەم دیاردەیـەش لـە هـەموو ئـەو ناوچـە شوێنەواریانەدا دەیبینین کـە دۆزراونەتـەوە لـە نێـوان دەریـای ناوەڕاسـت و لـە ڕۆژئاوا و تاوەکو ناوەڕاستی ئاسیا لە ڕۆژهەڵاتەوە، هۆکارەکەشـی دەگەڕێتـەوە بۆ هاوسانی کەش و هەوا لەو چاخەدا.

لە شوێنەواری (بالی کورە) لە کوردسـتاندا پاشمـاوەی داری حـور و عەرعـەر بەدیکراوە کە بەکارهێنراوە بۆ ئاگردان، ئەوە لە کەرەستەکانی چـاخی بـەردینی ناوەڕاسـتدا تێبینـی دەکرێـت ڕێگـەی قلێشـان و سـاف کـردن و ڕێکخسـتن، لـە شێوەی پارچەی سێ سەرییە، لەم شوێنەشدا چەند کەرەستەیەك دۆزراونەتـەوە لەوانە دەچن کە لە چینی سەرەوەی ئەشکەوتی زەرزێـدا دۆزراونەتـەوە، ئەمـەو سەرباری ئەو کارە ئەندازەییە دوولا لە نەخشاوانەی کە زۆر هاوشێوەن لـە گـەڵ ئەوانەی لە شوێنەکانی دەروبەری دەریای قەزوین لە ڕۆژهـەڵات و فەلەسـتین لـە ڕۆژئاوا دۆزراونەتەوە.

مرۆڤـی چـاخی بـەردینی ناوەڕاسـت سـەرەرای ئەشـکەوت چـەند مـاڵێکی کراوەشی بەکارهێناوە ئەو پەیوەندییەی هەیە لە نێـوان کـاری دانیشـتوانی ئـەم

شوێنانه بەڵگەن بۆ ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوانیاندا هەیە لە کاتێکدا هێشتا لە قۆناغی راوکردندان، لە کۆچەکانیاندا دوای ئاژەڵەکان دەکەتن و، ئەم شوێن کەوتنە بوو بەهۆی بەجێهێشتنی شاخەکان و هاتنە خوارەوە بەرەو دەشتەکان یان ئەو ناوچە بەرز و نزمانەی بە زۆری جۆرە جیاکانی ئاژەڵی تێدایە وەکو بزنە کێوی و بەرازی دەشتی و مەڕەکێوی و ئاسك و هیتر جگە لەمانە.

لە شوێنەواری کەریم شار هەندێك پاشماوەی دورستکراوی کلێنە سەرەتاییەکان بینراون ئاماژە بە قۆناغە راگوزەرییەکان چاخی بەردینی ناوەڕاست بۆ چاخی بەردینی نوێ (نیو لیث)، دۆزراوەکانی ئەم شوێنەوارە لەوەدەچن کە لە شوێنەواری چەرموو نزیك چەمچەماڵ دۆزراونەتەوە کە نموونەیەکی باشی لادێیە لە چاخی بەردینی نوێدا. ئەم پاشماوانەش پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە کۆمەڵگەی کشتوکاڵی و بەو پەیوەندییە ماددی و روحیانەوە کە لە نێو تاکەکانیدا هەبووە. لێرەدا ئەوەی شیاوی باسە ئەو پەیوەندییە هونەریانەی نێوان پیشەسازی کوردستانە لەم چاخەدا و لە نێوان ئەو پیشەسازییانەی کەلە دەوروبەری دەریای قەزوین بلاوبوونەتەوە.(١٠)

لە لایەکی ترەوە لە رێگەی ئەم پاشماوانەوە دەبینین ئەو کەرەستانەی کە مرۆڤ بەردەوامبووە لەبەرکاهێنانی لە چاخی بەردینی ناوەراستدا دروستیکردوون لە قۆناغە درێژەکانی چاخی بەردینی نوێدا، بەلأم پیشەسازییە مایکرۆلیثیە (وردەکان) وردە وردە ون دەبوو، دەشزانین کەشۆڕشی کشتوکاڵی زووتر لە رۆژئاوای ئاسیا دەستی پێکرد بەراورد بە ناوچەکانی دیکەی جیهان. هەڵکەنینەکانی (زاویێ چەمی شانیدەر) بەڵگەن بۆ دەرکەوتنی کشتوکاڵ لەم ناوچە کوردییەدا لە قۆناغە زووەکانی چاخی بەردینی کۆندا. ئەم زێدەش بە کۆنترین ناوچە کشتوکاڵییەکانی جیهان دادەنرێت. بە بەکارهێنانی (کاربۆنی

١٤) شوێنەوارناسی ئەمریکی (والف سۆلیکی) کە خۆی و ژنەکەی (رۆزا) هەستاون بە پشکنین لێرەدا، توانیان تەمەنی ئەم جێنیشینە دیاری بکەن بە (١٠٨٧٠–٣٠٠ پ.ز). دۆزراوەکانی ئەم جێنیشینە لە چەکوشی بەردی و ئامێری داپاچین، ئاماژە بەوە دەکەن کە مرۆڤ لێرەدا کەرەستەی ئەندازە وردی بەکارهێناوە، هەر لە رێگەی شێوەی دروستکردنی ئەم کەرەستانەوە خاتوو (رۆزا) سەردەمەکەی گەراندنەوە، بۆ ماوەیەکی کەم پێش چاخی بەردینی نوێ و ناوی لێنا (Protoneolith).(١١)

سیمای شارستانی لەم جێنیشینەدا هاوشێوەی ئەوانەن کە لە کەریم شار و ملفعات بینراوە، هەروەها پاشماوەکانی هی هەمان جۆر ولە هەمان چاخە، کە لە چینی (B) ناو ئەشکەوتی شانیدەر بینراوە.

ئەو کەرەستانەی لە ئەشکەوتەکانی شانیدەر و کەریم شار و زاوی چەمی شانیدەر و ملفعات بەڵگەی شێوازی گواستنەوەن لە چاخی بەردینی ناوەڕاستەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ، لەو چاخەی کە کەرەستەکانی مرۆڤ تیایدا لە گشت جێنیشینەکانی کوردستاندا لە یەك ئەچن، بەلام ئەم پیشەسازیە خۆجییانە لەسەردەمی کشتوکاڵیدا خۆرسکێکی تایبەتیان هەیە لە کوردستاندا کە جیاوازترە لە هەندێ لەوانەی لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئاسیادا بینراوە، لە گەڵ ئەوەشدا ئەتوانرێت هەندێ نزیکبوونەوە بەدیبکرێت لە گەڵ پیشەسازی سەردەمی کشتوکاڵی دانیشتوانی دۆڵی (نطوف)دا لە فەلەستین و باکووری سوریا هەتاوەکو قیلیقیا (بە تایبەتی لە ناوچەکانی ئامرك و میرسین) لە باشووری تورکیا، ئەم پەیوەندیانەش لە ماوەیەکی دەرەنگتردا زیاد دەکات. دەردەکەوێت کە هێڵی پەیوەندیەکان لە چەرموو لە کوردستانەوە درێژ دەبێتەوە بەرەو سیالك لە باکووری کاشان لە ئێران و هەتاوەکو جیتۆن لە

ناوەڕاستی ئاسیادا، لە ڕۆژئاواش دەگاتە ئەریحا لە فەلەستین کە جێنشینێکی کشتوکاڵی بووە لە هەزارەی چوارەمی پێش زاییندا لە پاڵ گەشەسەندنی بەرەو شاری شوراتۆکمەو لە بازرگانیشدا ناوبانگی دەرکردووە. لێرەدا بە تەنیا راوەماسی نەیتوانیوە بنچینەی ئابووری پێك ناهێنێت، بەڵکو کشتوکاڵ لەم شارەدا لە پاڵ ڕاوی ئاژەڵان بە شێوەیەکی گشتی لە گەڵ بازرگانیدا یەکێك لە کۆڵەکەکانی ئەو بنچینەیە پێکدێنێت، بەرهەمی کشتوکالیش تەنها بۆ (اکتفای ذاتی) بوو، پێی ئەچێ نشینگەی بە ناوبانگ لە کوردستانی ئێران (تەپەسەراو) لە ناوچەی کرماشان لە شێوازی بژێویدا لە هاوشێوەکانی بچێت لە ڕۆژئاوای ئاسیادا. سەرەڕای نەدۆزینەوەی خانوو، ئەوا چەند قاپ و و دەفرێکی چێشتلێنان و خواردنی گلێنەیی نەبرژاویان دۆزیوەتەوە کە نەخشی سەرەتایی سادەی لەسەرە. بەلاّم کەرەستەکانی کارکردن لە بەردی ئۆبسید دروستکران و دروستکردنەکەی لەوانە دەچێت لە شوێنەواری چەرموودا دۆزراونەتەوە.(١٢)

بەلاّم پاشماوە شوێنەوارییەکانی نیشنینگە ئاسیاو لە ڕۆژهەلاّتی کرماشان بە هەمان شێوە ئاماژە دەکات بە شێوازی ژیانی کشتوکاڵی تیایدا، هەروەها لێرەدا خانوو و ماڵێکی زۆر لە چاخی بەردینی ناوەڕاست دبینرێت، لێرەدا دەبینرێت کە لە جۆری خانووەکانی کەریم شارن.(١٣)

بە شێوەیەکی گشتی لە تواناادا هەیە بوترێت، لە کوردستاندا دوو جۆر نشینگەی کشتوکاڵی هەیە. یەکەمیان پەیوەندیی بە چاخی بەردینی نوێی بەرینەوە هەیە. کە هەندێ جار سیمای لە گەڵ چاخی بەردینی ناوەڕاستدا تێکەڵ دەبێت وەکو کوردجای و چینەکانی خوارەوەی چەرموو کە پیشەسازی گلێنە تیایدا هەمیشە سەرەتاییە. جۆری دووەمیشیان ئەوەیە کە لە چینەکانی سەرەوەی ئەم نشینگە کشتوکاڵیانەدا دەبینرێت کە پیشەسازی گلێنە

تیایداپێشکەوتوو و تۆکمە و ئەستوور بووە وەکو ئەوانەی لە چەرموو بینراون هەروەها ئەو هاوشێوانەی لە ئەریما و سیالك و حەسوونە و سامەرا و جنتال و هیوك بینراون. دوای ئەم ماوەیەش لە زۆربەی ناوچەکانی رۆژئاوای ئاسیادا ئەو نشینگانە بلاوبوونەوە کە پەیوەندییان هەیە بە چاخی (ئەنیۆلیت) (چاخی بەردینی –کانزایی)یەوە هەیە، کە چاخێکە پێش قۆناغی دەرکەوتنی نووسین و دەستپێکردنی نووسینەوەی مێژوویی دەکەوێت.

بەشێك لە شوێنەواری چاخی کشتوکالی
لە ( تەپە سەرا ) کوردستانی ئێران





**هەندێ لە لایەنە هونەرییەکانی چاخی کشتوکاڵی**

**لە نموونەکانی ( چەرموو )**

### ب- گرنگترین شوێنەوارەکان لە کوردستاندا

توێژەرەکان کۆکن لە سەر ماوەی چاخەکانی پێش مێژوو کە مرۆڤ لە کوردستاندا بۆ یەکەمجار کشتوکاڵی دەیمی ئەنجامداوە لەو ناوچە بەرز و نزمیە دەشتیەکان و دۆڵە فراوانەکان لە دوای ماوەیەکی کەم لە دوا چاخی بەفریندا (فۆرم) ئەوەش لە نزیکەی دەهەزار ساڵ پێش زاین.

ئەو ناوچە شوێنەواریانەی لە کوردستاندا دۆزراونەتەوە بە هەمان شێوە دەیسەلمێنن کە ئەو چاخە باراناویانەی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا رووی دەدا، دەرئەنجامی رووداوی چاخە بەفرینەکانە لە ئەورووپا بەراورد بە ناوچەکانی دیکە کاریگەریی لە سەر کوردستان باشتر بووە، چونکە دەرەنجامە شارستانییەکانی ئەم چاخە باراناوییە لە ناوچەی کوردستانیش دەرکەوتووە، لە خوارەوە گرنگترین شوێنەوارەکان دەخەینەڕوو و خستنەرووەکەشمان بە پێی زنجیرەی کاتی دەبێت.(١٤)

### ئەشکەوتی شانەدەر :

گەورەترین و بە ناوبانگترین ئەشکەوتی کوردستانە، کە دەکەوێتە بەشی باشووری چیای برادۆستەوە لە سەر دۆڵی زێی گەورە نزیک شارۆچکەی شانیدەر، یەکەمجار فەرمانگەی شوێنەوار و کەلەپوور ئەم ئەشکەوتەی دۆزییەوە، بەڵام یەکەم کەس کنەو پشکنینی تیا ئەنجامداوە پرۆفیسۆری ئەمریکی (رالف سۆلیکی)ە هەڵکۆڵینەکانی لەو ئەشکەوتەدا لە ساڵی ١٩٥١ز دەستپێکردووە و بەردەوامبووە تا ساڵی ١٩٦١ز لە گەڵ ئەوەشدا تاوەکو ئێستا زۆر لە قوڵای ئەشکەوتەکە هەڵنەکۆڵراوە.

ئەو قوڵییەی کنەو پشکنینەکان پێی گەیشتوون دەکاتە ١٤ مەتر، ئەم قوڵیەش لە پاشماوەی چوار چینە شوێنەواری سەرەکی پێکدێت و لە سەرەوە بەم پیتانە ناونراوە A، B، C، D، لەرێگەی پرۆسەی شیکارکردن بەکاربۆنی ١٤ (C14) تەمەنی دوایین چین بە ٦٠–٤٥ هەزار ساڵ مەزەندە کراوە.

لە چینی ناوبراودا پاشماوەی ئێسکی ئاژەڵی کێوی دۆزیوەتەوە، وەکو کەڵەگا و مەڕو بزن و پشتە کیسەڵ، لە گەڵ ئەوەشدا چوار ئێسکە پەیکەرییش دۆزراوەتەوە، یەکەمینیان: دەگەرێتەوە بۆ منالێکی تەمەن شەش مانگ، سیانەکەی تریش دەگەرێتەوە بۆ سێ کەسی گەورە، یەکێکیان لە منالییەوە دەستێکی لە کارکەوتوو تەمەنی بە ٢٥ ساڵ مەزندە کراوە، لە رێگەی پشکنینی ئێسکی ئەو پەیکەرانەوە بۆ پشکنەرەکە دەرکەوت کە ئەو مرۆڤەی ئەم پەیکەرانەی بۆ دەگەرێتەوە، مرۆڤ نیاندەرتاڵە کە پێی مرۆڤی ژیر هۆموسابینس) هەبوون.

ئەوەی سەیر بوو ئێسکە پەیکەری ئەو کەسە بوو کە لە منداڵیەوە دەستێکی لە کارکەوتبوو، پشکنەرەکە هەندێك لە خۆڵی سەر پەیکەری ناوبراوی برد و دوای شیکردنەوە بۆ نموونەیەك ئەنجامدا، دەرکەوت کە خۆڵەکە هەندێ تۆوی هەلاڵەی تێدابوو، دەگەرێتەوە بۆ هەشت جۆر گوڵ. کاتێك کە بە پرسیاری لەوەکرد کەچۆن تۆوی هەلاڵە گەشتۆتە ناو ئەشکەوتەکەو نزیك ئێسکە پەیکەرەکە، بڕوای وابوو کە مرۆڤی نیاندەرتاڵ گوڵی خستووەتە سەر گۆڕی مردووەکانی بێگومان ئەم لێکدانەوەش بەهرەمەندیەك دەداتە پاڵ مرۆڤی شانیدەر کە چەشنی نیە لای مرۆڤی ژیر، لە بەر ئەوە بە گومانن لەم لێکدانەوەیە. لە بەر ئەوەی تەکنیکە جۆراوجۆرەکان هیچ بەڵگەیەکی تری دەرنەخست بێتە پاڵپشتی ئەم لێکدانەوەیە، پشکنەرەکە ناچار بوو شیکاریی

بۆ نموونەیەکی تری ئەو خۆڵە بکات کە لە ئەشکەوتی شانیدەر دەستی کەوتبوو. دەرەئەنجامی شیکاریە تازەکە بۆی دەرخست کە تۆوی هەلآڵەکان دەگەڕێتەوە بۆ چەند گوڵێك، حەوتیان بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی بەکاردێت و جۆری هەشتەمیش جۆرێك بووە لە ژەهر، لە ئەنجامی ئەم شیکارییە نوێیەدا پشکنەرەکە دڵنیابوو کە مرۆڤی شانیدەر جۆرەکانی گوڵی ناسیوە و ئەو جۆرە سروشتیانەشی ناسیوەتەوە کە یارمەتیدەری چاکبوونەوەی نەخۆشییەکانن کە خاوەنی ئەو ئێسکە پەیکەرەی دەستی لە کارکەوتووە لە منداڵییەوە ئەو گولآنەی خواردووە بە هیوای چاکبوونەوەی دەستی، بەلآم کاتێك کە هیوای چاکبوونەوەی نەماوە، جۆری هەشتەمی خواردووە بۆ ئەوەی کۆتایی بە ژیانی کەساسی خۆی بهێنێ. سەرباری ئەم راستییە کە تایبەتەی بە گوڵ، ئەو ئێسکە پەیکەرانەی لە ئەشکەوتی شانیدەردا دۆزراونەتەوە گرنگیەکی گەورەیان هەیە، لە بەر ئەوەی پاشماوەی کۆنترین مرۆڤە کە تاوەکو ئێستا لە عێراقدا دۆزراونەتەوە، ئەمەو ئەو کنەو پشکنینانەی لە ئەشکەوتی ناوبراودا کراوە ئامێری کونکەر و توێکەری بەردینی دەرخستووە، بەڵگەیەکی گەورەمان بە دەستەوە دەدا کە مرۆڤی شانیدەر لە خۆراکیشدا پشتی بە گۆشتی ئاژەڵ بەستووە و لە جلوبەرگیشدا پشتی بە پێستەکەی بەستووە.

ئەو چاخە بەردینەی مێژووی ئەشکەوتەکە بۆی دەگەڕێتەوە پێی دەوترێت چاخی مەستیری، کەچی پشکنەری ئەشکەوتی شانیدەر پێشنیازی کرد ئەو چاخەی چینەکانی ئەشکەوتی شانیدەری بۆ دەگەڕێتەوە دەستەواژەی (چاخی برادۆستی) پێ بوترێت، لە سەر ناوی چیای برادۆست. ئەمەو شوێنەوارەکانی ئەشکەوتی بێخاڵ کە کەتۆتە باکووری گوندی هەڤدیان، دەگەڕێتەوە بۆ چاخی

مەستیری (چاخی برادۆستی)، شاندێکی ئەمریکی لە زانکۆی شیکاگۆ ساڵی ١٩٥٥ لەم ئەشکەوتەدا پشکنینی ئەنجامداوە، بەڵام ئەو شوێنەوارەی لە رووی مێژووییەوە پێش ئەشکەوتی شانیدەر دەکەوێت، ئەشکەوتی (بەردە بەلەکە)یە، کەوتۆتە ٣٠٠ مەتر باکوری رۆژهەڵاتی چەمچەماڵەوە، کە تیایدا چەند تەورێکی دەستی دۆزراوەتەوە مێژووەکەی بە سەد هەزار ساڵ مەزەندە دەکرێت.

## ئەشکەوتی هەزار مێرد:

ئەشکەوتی هەزار مێرد دەکەوێتە (١٣کم باشووری سلێمانی)ەوە، پرۆفیسۆر برێدوود یەکەم کەسە کنەو پشکنینی تیا ئەنجامداوە، ئەویش ساڵی ١٩٢٨ بووە، دەرەنجامی پشکنینەکان دۆزینەوەی چەند کەرەستەیەکی بەردینی لێکەوتەوە کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ خولی مەستیری لە چاخی بەردینی کۆن (٥٠٠٠٠ پ.ز).
ئەم راستییەش ئەوە دەسەلمێنی کەماڵەکانی ئەم ئەشکەوتە هاوچەرخی ماڵەکانی شانیدەرن، بۆ زانیاری پشکنینە شوێنەواریەکان ئەشکەوتی ناوبراودا هیچ پاشماوەیەکی ئێسکە پەیکەری مرۆڤیان نەدۆزییەوە.

لە بەر ئەوە کنەوپشکنینەکان لە ئەشکەوتەکانی ناوچەی کوردستاندا لە ئەشکەوتی شانیدەر نەبێ هیچ ئێسکە پەیکەرێکی مرۆییان نەدۆزییەوە، بۆیە ئەتوانین گریمانەی ئەوە بکەین کە مرۆڤی شانیدەر (نیاندەرتاڵ) ئەگەر مردووی ناشتبێ، ئەوا لە دەرەوەی ئەشکەوتەکان ناشتوویەتی نەك لە ناوەوەی، لە بەر ئەوە مانەوەی پەیکەری چوار کەسەکەی ناو ئەشکەوتی شانیدەر هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ شتێکی بەدەر لە ویستی ئەوان.

ناوی (هەزار مێرد)یش واتای هەزار پیاو دەگەیەنێت، باوەڕ وایە کە هۆکاری ئەم ناوە دەگەڕێتەوەبۆ فراوانی ئەم ئەشکەوتە کە شوێنی هەزار پیاوی تیا دەبێتەوە، یان ئەم ناوە پەیوندی بە پلەیەکی سەربازییەوە هەبێت، هەزار مێرد واتە: هەزار سەکردە.

**ئەشکەوتی زەرزیَ:**

لە شاخەکانی بەرامبەر سوورداش ئەشکەوتێکی بچووك هەیە پێی دەڵێن (زەرزیَ) زۆر دوورنین لە هەردوو ئەشکەوتی دەستکردی قزقەپان و کوڕ و کچەوە، کچە توێژەری ئەمەریکی (گاروود) لە ساڵی ١٩٢٧ کنەو پشکنینی لەم ئەشکەوتەدا ئەنجامداوە، تیایدا چەند شوێنەوارێکی کۆتاییەکانی چاخی بەردینی کۆنی دۆزییەوە و زۆربەشیان لەو ئامێرە وردانە بوون کە ماوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوازدە هەزار ساڵ لەومەوبەر. جگە لە (گاروود)ی ئەمەریکی پرۆفیسۆر (هاو)یش لەم ئەشکەوتەدا کنەو پکشنینی کردووە ئەویش چەند شوێنەوارێکی کۆتایی چاخی بەردینی ناوەڕاستی دۆزیوەتەوە، لە ڕێگەی ئەو دەرەنجامانەی گاروود و پرۆفیسۆر (هاو) بەدەستیان هێناوە دەرکەوتووە کە ئەشکەوتی زرزیَ لە رووی کاتەوە هاوشێوەی شوێنەواری (بالیکورا و چینی (B) ئەشکەوتی شانیدەرە). ئەم راستییەی ئەشکەوتەکانی هەزار مێرد و زەرزیَ، دڵنیامان دەکاتەوە کە ژینگەی ئەشکەوتی شانیدەر زۆر گونجا و بووە بۆ ناوچەی کوردستان، کە تاکە ئەشکەوتە ژیانی تیا بەسەر ببرێت لە ٦٠٠٠٠ تاوەکو و ١٠٠٠٠ هەزار پێش زایین.

## چەرموو:

گوندی چەرموو دەکەوێتە سەر کەلاتێکی کە بەرز دەڕوانێتە دۆڵی (چەمە کووران)، کە یەکێکە لە زێیەکانی رووباری عوزێم و تۆقچای، ١١کم لە رۆژهەلاتی چەمچەماڵەوە دوورە، ئاستی بەرزی لە دەریاوە ٢٥٠٠ پێیە رووبەرەکەی ٩٠×١٤٠م، قوڵی پاشماوە شوێنەوارییەکانی نزیکەی (٧م) لە بەرزترین خاڵی نیلەوە، پێدەچێ بەشێك لە گوندەکە ئاو ڕایماڵیبێت.

دوای دۆزینەوەی شوێنەواری چەرموو لە چلەکانی ئەم سەدەیە لە لایەن بەرێوەبەرایەتی شوێنەوار و کەلەپوورەوە، شاندێکی شوێنەوارناس لە پەیمانگای رۆژهەلات لە زانکۆی شیکاگۆ ساڵی ١٩٤٨ز تاوەکو ١٩٥٥ز بە سەرۆکایەتی فرۆفیسۆر وود دەستی بە کنەو پشکنین کرد، تیمەکە توانی شازدە چینی شوێنەواری دەربخات، یانزە چینی یەکەمی گردەکە (بەدەستپێکردن لە خوارەوە) هیچ ئاسەوارێکی کلێنەیی تیانەبوو، بۆیە ئەم چینانەیان گەڕاندەوە بۆ قۆناغی (پێش گلێنە) پەرێزی لەمجۆرە لە چەند نشینگەیەکی رۆژهەلاتی خوارو دۆزراونەتەوە وەکو ئەریحا لە فەلەستین و (جەتل هیرك) لە تورکیا، ئاسەوارە گلێنەیەکان تەنها لە پێنج چینەکانی شوێنەواری سەرەکی گردەکە دەرکەوتووە ئەمە و پرۆفیسۆر برێد وود پێی وایە ئەو ماوەی کە شانزە چینەکەی شوێنەواری چەرمووی تیا پێکهاتووە بە ٤٠٠ ساڵ مەزەندە دەکرێت. لە رێگەی شیکاری بە (کاربۆنی ١٤) وادیارە شوێنەواری چەرموو مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ٧٠٠٠ پ.ز. خانووەکانی گوندەکە بە ٣٠ خانوو مەزەندە کراوە و دانیشتوانەکەشی بە ١٥٠ کەس.

دانیشتوانی چەرموو جۆرە دانەوێڵەییەکان چاندووە کە لەبنەچەدا دەشتییە، هەروەها جۆ و نیسك و نۆکیشیان چاندووە، زۆریش گرنگی داوە بە

بەرووبوومی دار بەڕوو پستە، ئەو ئاژەڵانەش کەماڵییان کردووە و پاشماوەی ئێسکیان دۆزراوەتەوە، بزن و مەڕ و بەرازە، کەچی هیچ بەڵگەیەك نییە لە سەر راگرتنی مانگا، هێلکە مارانەش بەشێکی گرنگی پێکهێناوە لە خۆراکی دانیشتوان.

لە بارەی نیشتەجێبوونیشەوە دانیشتوانی چەرموو ئەو زنجە سەرەتاییە خرەیان تێپەڕاندووە کە پێش چەرموو بڵاوبووە، ماڵەکانیان شێوە لاکێشەو لە قوڕین دروستکرابووە، خانووی چینە بەرزەکانیش لە سەر بناغەی بەردی سروشتی بنیاد دەنرا دیواری خانوەکان بە قوڕ سواق دەدران دوای ئەوەی چینێك قامیشیان دەخستە ژێرەوەی زەمینەکەی قوڕتاو دەکرا. قامیش و دار بەکاردەهات بۆ دارەڕاکردنی خانووەکانیان.

لەو کەلوپەلانەی ناوماڵ کە لە چەرموو دۆزراونەتەوە کەوچکی ئێسکین و دەرزی ئێسکین و خولخولەی رشتنی بەردینە، کە بەڵگەیە بۆ ئەوەی دانیشتوانی چەرموو شارەزاییان لە ڕستن و چنین دا هەبووە.

سەرەڕای ئەوانەش کۆمەڵە کەرەستەیەکی بەردینی ورد هەن لە بەردی سوان و بەردی ئۆبسید دروستکراون لەوانە ئەو تیغانەی بە قیر بەستراون بە دارەوە، و لە شێوەی داسە.

کەرەستە گەورەکانیش لە بەردی کلس دروستکراون، وەکو پاچ و دەستاڕ و دنگو مێکوت و ژمارەیەك لە دەفری ماڵەوە، لە بابەتی جوانکاریش بازنی دروستکراوی بەردی مەڕمەڕ و ملوانکەی سەدەف و کوێچکە ماسی، سەبارەت بە باوەڕە ئاینییەکانی دانیشتوانی چەرموو ئەوا بە پیتی و هەرشتێك ببێتە مایەی زۆری بەرهەم دەپەرسترا، ئەو پەیکەرەیان دەکردە هێمای پەرەستنیان کە وێنای خواوەندی دایکی دەکرد.

ئەمەو لەو گوندە گشتوکاڵیانەی لە مێژوودا پێش گوندی چەرموو کەوتووە گوندی زاوێی چەمی شانیدەرە کە کەوتۆتە سەر کەناری زێی گەورە لە نزیك چاڵگەی شانیدەر، کە کارەکانی کنەو پشکنین تیایدا بەڵگەیە بۆ بوونی کۆنترین ئەو قۆناغانەی مرۆڤ تیایدا فێری کشتوکاڵ بووە. بۆیە لەم گوندەدا هیچ ئاسەوارێکی گلێنەیی نەدۆزراوەتەوە، کەواتە لە قۆناغی (پێش گلێنە)یە.

دەربەندی گاوڕ:

مانای ناوی (دەربەندی گاوڕ) (تەنگبەری کافران)ە، ئەم دەربەندە ٤٥ کم لە قەرەداغەوە دوورە، لە سەر ڕووی شاخەکە لای دەربەندی ناوبراو نەخشێکی چیایی هەیە وێنای کەسێکی جەنگاوەری ریشن دەکات، درێژییەکەی نزیکەی ١٠ پێیەو کلاوئاسنێکی خڕی لە سەردایە، بە یەکێك بە دەستەکانیەوە کەوانێك هەیە، بە دەستی راستیشی چەکێکی هەڵگرتووە لەوانەیە تەور بێت، قاچی چەپی لە لای ئەژنۆیەوە بەستراوەتەوە وەك ئەوەی لە رۆیشتندا بێت، لە پێیدا دوو کەسی کوژراو هەن، هەریەکەیان بە چوار یەکی قەبارەی جەنگاوەرەکەن.

یەکەم کەس کە وێنەی ئەم هەڵکەندراوەی بلاوکردۆتەوە و لە سەر و نووسیوە (ئێدمۆندز)ە c.j.EDMONDS ئەوەش ساڵی ١٩٢٥ بوو، بەلام ئەو وێنەی بلاوی کردەوە زۆر ڕوون نەبوو بۆیە پەیمانگای شوێنەوارناسی ئەڵمانی لە بەغداد ساڵی ١٩٦٠ ز، بڕیاری دا دووبارە وێنەی بۆ نەخشی چیایی ناو براو بگرێت، بۆ ئەم مەبەستە (ئیڤاشستەر و مانکەر) راسپێرا و لە هاوینی هەمان ساڵدا رۆیشت بۆ دەربەندی گاوڕ و هەستا بە وێنەگرتنی بە شێوەیەکی ڕوون و بە گرتەی جیاواز. دواتر هەستا بە لێکۆڵینەوە لە سەر نەخشە چیایەکە و لێکۆڵینەوەکەی لە بەشی گۆڤاری پەیمانگای شوێنەواری ئەڵمانی

(هەواڵەکانی بەغداد) بلآوکرایەوە، لە لێکۆڵینەوەکەیدا گەشتە ئەوەی کە ئەو کەسەی وێنەکەی لەسەر نەخشی چیایی لە دەربەندی گاور کێشراوە پێدەچێ پادشای ئەکەدی نەرام سین ۳۲٦۰ –۲۲۲۳ پ.ز بێت، چونکە زۆر لە وێنەی پاشا نەرام سین دەچێ کە لە سەر میلی



**نەخشی چیایی دەربەندی گاور**

سەرکەوتن هەیە لە شاری سوسا. ئەم راستییە لە رێگەی ئەو نووسینە بزمارییانەوە پشتڕاست کراوەتەوە کە بۆی دەرخستووین گوایە لۆلۆیەکان لە سەردەمی پادشاکەیان ساتۆنی لە دژی نەرام سین یەککگرتنی لە گەڵ ولاّتی (میدووری)دا کردووە، بۆیە نەرام سین شالاّوێکی سەرکەوتووی لە دژی ئەم یەککگرتنە ئەنجامداوە و بە نەخشی چیایی دەربەندی گاور سەرکەوتنەکەی بە زیندویی هێشتەوە.

## ئەشکەوتی کوڕ و کچ

لە ناوچەی قزقەپان ئەشکەوتێکی دەستکرد هەیە بە ناوی (ئەشکەوتی قەزقەپان) دەکەوێتە پشت گوندی شرناخەوە، کە ئەتوانرێت بە بێ کەرەستەی سەرکەوتن پێی بگەی. لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا پایەیەك هەیە پانییەکەی نزیکەی شەش پێ ئەبێ، وە لە بەردەمیدا دوو کۆڵەکە هەیە کە دوو پێ لە ڕووی ئەشکەوتەکەوە دوورن کە تەنها بنچینەکەی ماوە بەهۆی تێکدانیەوە لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە چونکە سەرکەوتنی ئاسانە.

لە رووەکەیدا دەرگایەك هەیە بۆ ژوورێك ئەچێ درێژییەکەی حەوت پێیەو پانییەکەی پێنج پێیە بەرزییەکەشی چوار پێییە، کراوە بە دووبەشی یەکسانەوە، لەر هەر بەشێکا چاڵێکی مردوو ناشتنی تێدایە لەسەر شێوەی حەوزێکی لاکێشە، سەبارەت بە مێژووی ئەم ناشتنگایە هیچ زانیارییەکمان دەربارەی نییە، بەلاّم پسپۆرانی مێژووی میدی پێیان وایە کە دەگەرێتەوە بۆ سەرەتای برگەی میدی، بۆیە پێمان وایە کە ئەمە گۆڕی پادشای میدی (فراوەرتیس)ە، چونکە مێژوو نووسی یۆنانی هێرۆ دتس لە نووسینەکانیدا سەبارەت میدیاکان باسی لەوە کردووە کە پادشا (فراوەرتیس) لە کاتی

هێرشکەی بۆ سەر وڵاتی ئاشوور کوژراوە لە نزیك ئەم شوێنەی ئەشکەوتەی لێیە.

## ئەشکەوتی قزقەپان

لە سەر یەکێك لە شاخەکانی (سەرسەرد)ی ناحیەی سورداش ئەشکەوتێك هەیە لەسەر شاخەکە هەڵکەنراوە بە ناوی "قزقەپان"ەوە، مانای ناوی ئەم ئەشکەوتە (زەوتکەری کچ)ە، ئەم ئەشکەوتەش لە سەر ڕووی شاخەکە هەڵکەنراوە بە بەرزی (٢٥ پێ) لە زەوییەوە، لە ڕووی شاخەکە لە نێوان زەوی و کونی ئەشکەوتەکەدا بە ستوونی داتاشراوە، بە چەشنێك نەتوانرێت بۆی سەرکەوی، واتە بە پێچەوانەی ئەشکەوتی کوڕ و کچەوە کە بە گوریس یان پەیژە نەبێت ناتوانرێت پیایا سەرکەوی.



## تابلۆی ئەشگەوتی قزقا پان

کونی ئەشکەوتەکە ڕووی تەلارێکی لێوە پێکدێت درێژی ئەم ڕووە ٢٣ پێ، قوڵی ٩، ٥ پێ، بەرزییەکەی ١٣، ٥ پێ، لە هەردوولای دەرگاکەکەوە دوو

کۆڵەکە هەیە هەر یەکەو تاجێکی لەسەرە لە سەر شێوازی ئەیونی ئەغریقییە، لە سەر دەرگاکە لە نێوان هەردوو کۆڵەکەکەدا ئەفەرێزێکی چوارگۆشە هەیە کە وێنە دووکەسی تێدایە لە نێوانیادا ئاتەشگایەك هەیە، لە سەرووییەوە هێمای سێ خوداوەند هەیە، لەوانە هێمای خواوەند ئاهورامەزدا، ئەو دەرگایەی لە نێوان دووکۆڵەکەکەیە بۆ ژوورێکی ناوەراستی ئەچێ لەوێشەوە بۆ دوو ژووری ئەملا و ئەولا، لە زەمینەی هەریەك لەم سێ ژوورەدا چاڵێکی مردوو ناشتنی لاکێشەیی هەیە درێژییەکە نزیکەی دوو مەتر ئەبێت، ناتوانین ئەو سەردەمە بناسینەوە کە ئەم ناشتنگایە شاخاوییەی بۆ دەگەرێتەوە، بەلاَم بەراورد بەو ئەشکەوتانەی هاوچەشنی خۆین لە ولاَتی فارس و یەکێکیشیان لە شاخەکانی هەورامان، و بە گەرانەوە بۆ شێوازی ئەیۆنی لە هەردوو کۆڵەکەکەی رووی ئەشکەوتی قەزقەپان ئەوا تەمەنی ئەم گۆرە لە نێوان ٦٠٠ بۆ ٥٥٠ پ.ز دایە واتە: دەگەرێتەوە بۆ چاخی میدی لەوانەشە ناشتنگای کاربەدەستانی ئەو ناوچانە بێت کە سەر بە میدییەکانن.

## نەخشی چیایی شاخی هەریر

ئەو شاخەی کە نەخشی چیایی لەسەرە یەك کیلۆمەتر لە شارەدێی هەریرەوە دوورە، کەلە سەر بەر بە بەرزی ٥٠ مەتر نەخشراوە و درێژی نەخشەکە دوو مەتر و نیوە، کە وێنەی کەسێك دەگەیەنێت وەستاوە و کلاَو قۆچێکی لەسەرە و جلێکی شۆری لەبەرە وەکو شەواڵە لە تەنیشتیەوە رمێکی درێژ هەیە، هەروەها دەستی راستی بۆ پێشەوە درێژکردۆتەوە.

ئەمەو نەخشە چیایەکە هیچ نوسینێکی لەخۆ نەگرتبوو کە یارمەتیمان بدات بۆ زانینی سەردەمەکەی بەلاَم بە پشت بەستن بە جۆری ئەو جلوبەرگەی

کەسی وێنکێشراوی ناو نەخشەکە پۆشیبووی هەروەها پشبەستن بە شێوازی هەڵکۆڵینی نەخشە چیایەکە، شوێنەوارناسان لاسەنگی ئەوەیان کرد کە دەگەڕێتەوە بۆ دەمی (فرسی) بە بێ ئەوەی بزانن هۆکاری هەڵکۆڵینەکەی چییەو ئەو کەسە کێیە وێنەکەی بۆ کێشراوە.



نەخشی چیایی شاخی هەریر

## شوێنەوارەکانی خورماڵ

لە شارەدێی خورماڵ رێکخەرێکی کۆن هەیە بۆ دابەشکردنی ئاو لە چەماوەی بەردین دروستکراوە و لە تەنیشتیشیەوە کانیە کبریتیەك هەیە، سەبارەت بە مێژووەکەی بە تەواوەتی نەزانراوە بەلأم لاسەنگییەکەی ئەوەیە کە بگەرێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەردەمی ساسانی، بەلأم چەند جارێك لە سەردەمانی تردا نەوژەن کراوتەوە.

ئەمەو بەرێوەبەرایەتی شوێنەوار و کەلەپوور شورایەکی شوێنەواری دۆزیوەتەوە کە دەوری خورماڵی داوە شێوە و دوورییەکانی بە هێلکاری تۆمار کراوە هەروەها قەلأیەکی شێوە لاکێشە لە کەناری شارەکە دۆزراوەتەوە لە ناو ئەم شورایەدا، هەروەها قەلأیەکی تریش لە شووراکە دۆزراوەتەوە کە دەکەوێتە کۆتایی باکووریەوە، ئەم دووبینا بە بەرد و گەچ دورستکراون و قولەی نیوە بازنەییان تێدایە.

چەمی رووباری زەلم بە شارە کۆنەکەدا دەڕوا و شارەکە کۆنەکە دەکاتە دووبەشەوە پردێکی بەردینیش ئەومبەر و ئەوبەری بە یەکەوە ئەبەستێ کە تاوەکو ئێستاش پاشماوەکەی دەبینرێ، ئەو رێکخەرەی کە باسکرا دەکەوێتە گۆشەی باکووری شارەکە لەو شوێنەی ئاوی زولم و کانییە کبریتییەکە یەك دەگرنەوە.

لە ناوەراستی شارەکەشدا مزگەوتێك هەیە تاکو ئێستاش بەکاردێت، تابلۆیەکی نووسینی تیایە باس لە ناوی بنیادنەرەکەی سەلیم پاشای بابان دەکات لە نزیکەی ١١٦٠ کۆچی، بنیادی مزگەوتێکی تریش دەگەرێننەوە بۆ سەلیم پاشا، دەکەوێتە دێی عەبابەیلێ نزیك بە هەڵەبجە، کە بەناویەوە نووسێنێکی هەڵکۆڵراوی سەر بەرد هەیە.

ئەگەرێکی گەورەش هەیە کە شوێنەوارەکانی خورماڵ پاشماوەی شاری شارەزوور بێت.

## نەخشی چیایی ئانوبانینی

ئەم هەڵکەنراوە وێنەیەکی قۆقزی سەربەردێکی شاخاوییە، دەکەوێتە ناوچەی (سەرپێڵی زەهاو) لە کوردستانی ئێران، یەکێك لە سەرکردەی لۆلۆیییەکانی تیا دەبینرێت، ناوەکەشی لە خوارەوەی هەڵکەندراوەکە نەخش کراوە بە نووسینی مێخی تیایدا هاتووە (ئانووبانینی وێنەی خۆی بەرامبەر بە خواوەندە عەشتار لە سەر شاخەکانی بادیر کێشاوە...هتد) ئانووبانینی لەوێنەکەیەدا وەستاوە و بەدەستەچەپی قامچییەکی هەڵگرتووە و ناویەتی بە سنگییەوە، بە دەستی راستیشی کوتەکێکی گرتووە کە هێمای سەرکردەیی و هێزە، سەریشی بە کڵاوەکەی سەری لەوانەن کە لە کۆندا لە کوردستان باوبوو لە هەردوو دەستیدا خشڵ و بازنگ هەیە و نەعلیشی لە پێدایە، پێی چەپی خستۆتە سەر سنگی یەکێك لەو دوژمنانەی کە لە زەویدا راکشاوە، لێرەدا دۆخی وێنەکە لە نەخشی چیایی دەربەندی گاور دەچێ کەچی پەیکەر سازەکان وێنەی ئانووبانینیان واکێشاوە کە وەستاوە بەرامبەر خوای جەنگ کە تاجێکی شاخداری بن خڕی لە سەردایەو جلێکی درێژی لە بەردایە کە تایبەتن بە خواوەندەکانەوە، ملوانەکەیەکی لە ملدایە لەسەر شانی چەند هێمایەك دەرچووە لە سەر شێوەی قامچی، وە بە دەستی چەپی گورزێکی گرتووە دوو دوژمنی پێ بەستراوە کەلە پشتییەوە دەبینرێت بە رووتی و لە باری پارانەوە و دۆڕاندا دەستیان لە پشتەوە بەستراوە، لەسەرەوەی وێنەی ناو نەخشەکەدا هێمایەکی خواوەند عشتار دەبینین کە پێکهاتووە لە ئەستێرەیەکی پێنجی لە ناو بازنەیەکدا. بەڵام دیمەنی خوارەوە وێنەی چەند دیلێکی دەست بەستراوە ئامادەن لە بەرامبەر پادشادا، پێنجیان کڵاوی سەریان هەمان جۆرە، شەشەمیشیان کە لەبەردەمەوەیە کڵاوێکی لەسەردایە لە کاتی ئەخمینییەکان لە ئێراندا باوبووە.



نەخشی چیایی ئانو بانینی

**تۆمارکراوەکانی پادشای خالدی**

لـە ناوچـە جیاجیاکـانی کوردسـتاندا کۆمـەڵێك تـابلۆی بـەردینی نووسـراو دۆزراوەتەوە کە لە نووسـینی مێخـی و زمـانی خەلـدی (زمـانی وڵاتـی ئۆراراتـۆ) نوسوراون، پەیوەندییەکی بەهێز هەبووە لە گـەڵ خـوری کۆنـدا. لەوانـە تـابلۆی (تۆبەرگ قەڵا) کە هی پادشا ساردووری دووەم بووە. کە پرۆفیسۆر ئۆربیلی لـە سەرەتای سەدەی بیستدا لە قەڵای شاری وان دۆزییەتیـەوە. تابلۆیـەکی تـریش هەیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ پادشـا ئارکیتشـی کـوڕی مینـەوا، شوێنەوارناسـی بـە ڕەچەڵەك جۆرجی (تسیریتیلی) ساڵی ١٩٢٨ لە هایدلبـەرگی ئـەڵمانی دەقەکـەی وەرگێڕاوە، لەوانەیە گرنگترینیان ئەو کۆمەڵە تابلۆیانـە بـن کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ پادشای ئەشبوینی و مینەوای کوڕی دەگەڕێتەوە بە تایبەتی ئەوەی بـە تـابلۆی کێلە شینی دەناسرێت کە بە زمانی خەلـدی و ئاشـووری نووسـراوە، کێلـە شـین (kel-i-chin) ناوچەی سـنووری نێـوان ئێـران و عێراقـە لـە خـاڵی شـنۆ، ئـەم تابلۆیە لە لایەن گۆتسۆ فرێد ریـك (j.friedrich agoetze) توێژینـەوەی بـۆ کـراوە وە سـبایزەر و کەسـانی تـر لـە سـەری نووسـیویانەو سـایك (sagce) دەقەکانی وەرگێڕاوە و بێندێکت لە گۆڤاری کۆمەڵەی توێژینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەمریکی باسـی لێـوە کـردووە، w.c.benedict theuratian-assyrian inscription of krlashim-jaos 81، 1961، لـە راسـتیدا مێـژووی تابلۆکە دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵی ٨١٠ پ.ز لـە دەقـە خەلدییـەکیان ئەمـە هـاتووە: (ئەشبوونی پادشای مەزن، پادشای جیهان، پادشای بیاینا، سـەرکردەی شـاری تووشـبە. .هتـد) لـە دەقـە ئاشـوورییەکەدا لـە جیـاتی (پادشـای بیاینـا) دەسـتەواژەی (پادشـای نـایری) هـاتووە کـە پەرسـتگای گـەورەی خاوەنـدە (خەلدی)یـە دەکەوێتـە شـوێنەواری موساسـیر (مەجسـیری ئێسـتا) بـە دووری

١٨كم له ره‌واندوزه‌وه ئه‌م خواوه‌نده لێره‌دا به (ئه‌لدی) ناسراوه. هه‌ریه‌ك له ئه‌شبوینی و مینه‌وا له تابلۆی كێله شیندا باسیان له‌و كاره گه‌ورانه‌ی خۆیان كردووه كه‌له خزمه‌تی په‌رستگای ناوبراودا كراوه. سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش هه‌ردوو پادشا به‌رده‌وام بوون له دانانی تابلۆی نووسراو له زۆربه‌ی ناوچه‌كان له‌وانه تابلۆی (میهر قابووس) له‌سه‌ر شاخی زه‌م زه‌م داغ نزیك شاری وان و له ڕێگای بتنووس– قه‌ره‌قۆش (نزیك ئه‌لوه‌دیری) په‌رستگایه‌كی تری تایبه‌تیان بۆ خواوه‌نده خه‌لدی دروستكرد دواتر ده‌ستیان كرد به دروستكردنی قه‌لاّ و كه‌لاّت له ناوچه‌كانی زه‌فستان و ئه‌نزه‌ف له ده‌وری شاری وان هه‌روه‌ها مینه‌وا قه‌لاّیه‌كی تری دروست كرد له‌سه‌ر ڕێگای شاری خوی له ناوچه‌ی شه‌كاكی كوردی دا. له پال ئه‌م شوێنه‌وارانه‌دا پادشا مینه‌وا چه‌ند هه‌والێكی كاری سه‌ربازی و ئاوه‌دانكردنه‌وی خۆی له چه‌ند تابلۆیه‌كی تردا نه‌خشاندووه كه له (قه‌لاّی گاه، نزیك شنۆی كوردستانی ئێران دۆزراونه‌ته‌وه، هه‌روه‌ها له قه‌ره گوندووس ئه‌و ناوچه‌یه‌ی كه له كۆتایی سه‌ده‌ی نۆیه‌می پێش زایینیدا داگیری كردووه.

له لایه‌كی تره‌وه له باشووری شاری ئارارات له ناوچه‌ی (ئاسكی دوگو بایه‌زید) تاوه‌كو ڕووباری (ئاراس) كۆمه‌ڵێك قه‌لاّ هه‌ن مینه‌وا دروستی كردوون، سه‌ره‌ڕای پاشماوه‌ی ئه‌و سه‌ربازگه هه‌میشه‌ییه‌ی كه تاكو ئێستا ئاسه‌وارێكی ماوه و له مێژوودا به ناوی مینه‌وا خینیلی (قه‌لاّی مینه‌وا) ناسراوه. ئنجا ئه‌توانین شوێنه‌واری پادشای خه‌لدی ببینین له هه‌ریه‌ك چۆله‌گرد نزیك تاش برون، وه له كورزیت قه‌لاّ، و مه‌واودێ و قه‌ره‌خه‌رمان و سه‌رجه‌م ئه‌م شوێنه‌وارانه تاوه‌كو ئێستا ئاسه‌واری دیاره.

لـه ناوچـەی (بـالو) و لـە کـەناری رووبـاری مورادسـۆ، مینـەوا تابلۆیـەکی نووسراوی بۆ بەجێهێشتووین کە تیایدا باس لـە هێرشـەکانی دەکـات بـۆ ولآتـی شبیشـیریا (بـالۆی ئێسـتا) تیایـدا پەرسـتاگیەیکی بـۆ خواوەنـد (خەلـدی) دروستکردووە، دواتر دەستی گرتووە بە سەر هەرێمـەکانی دیکـەی دەوروبـەری شاری (مەلاتیێ) ی ئێستا لە کوردستانی تورکیا.

لە نێوان سـاڵەکانی ١٩٥٠ – ١٩٧٥ بـە سـەرۆکایەتی بـۆرنی c.a.burney دەزگای شوێنەواری تورکی پاشماوەی چەند کارێکی خەلدیەکانی دۆزییـەوە لـە چەند شوێنێکی تری وەك وان و ئەرزرۆم و تووپرك قەلآ و ئالتوون تەپەو چاوش تەپەو چەند شارێکی تر.

ئنجا (مـاوەرتیس ڤـان لـۆن)ی هۆڵەنـدی لـەم کارانـە کۆڵییـەوە و ئـەنجامی لێکۆڵینەوەکانی لە ئەستەمبوڵ ساڵی ١٩٦٦ بلآوکردەوە. ئەگەر چی لە سـالآنی ١٩٦٠ – ١٩٨٠ هەوڵێکی زۆر دراوە بۆ دەرخستنی شـوێنەواری خولدییـەکان لـە کوردستانی ئێراندا و تاوکو ئێستاش لێکۆڵینەوە بەردەوامە لە نێـوان ئەنـدامانی شـاندی ئـەمریکی و ئـەڵمانی و سـۆڤێتی بـۆ گەیشـت بـە دەرەنجـامی توێژینەوەکانیان.

# دەروازەی دووەم

## بەشی یەکەم

دانیشتوانی دێرینی زاگرۆس و کوردستان

## بەشی دووەم

گۆڕانکارییە زمانەوانی و شارستانییەکان لە هەزارەی
دووەمی پێش زاین لە چیاکانی زاگرۆس و کوردستاندا

# بەشی یەکەم

## دانیشتوانی دێرینی زاگرۆس و کوردستان

گەلان لەسەر زەوی لە پرێکدا دەرنەکەوتوون کە خاوەنی هەموو جۆرە بەرگرییەکن، هەروەها مرۆڤ بە چەشنێك دەرنەکەوتووە کە ژیر بێت و خاوەن هێزێکی تەکنیکی ئالۆزبێت کە راستەوخۆ زاڵبووبێتە بە سەر سەرچاوە و یاسای سروشتیدا، بەڵکو مرۆڤ بە تەنها دەرکەوت و دواتر چووەتە ڕیزی ڕێکخراوێکی هۆزیەتیەوە وەکو یەکەم شێوەی ئەو کۆمەڵگانەی کە لە دوای دابڕانی سەرەتای هاتەکایەوە، کە خزمایەتیەك لە دایکەوە کۆیان دەکاتەوە و لە ڕێگای هەرە وەرزی و بەرگری هاوبەش لە بەرژەوەندییە گشتییەکان لە دەوری یەك کۆدەبنەوە.

لەسەرەتادا شانبەشانی پێشکەوتنی مرۆڤ گۆرانکاری قوڵ لە شێوازەکانی گردبوونەوەی خەڵك رویداوە تا دەرکەوتنی نەتەوەکان و پەیدابوون ئەم نەتەوانەش دەرەنجامی ئەو زۆربوونە سادەیەی ژمارەی کەسەکانی هۆزەکە نەبووە، بەڵکو بەهۆی دەرکەوتنی جۆرە کۆمەڵگایەکی نوێوە بووە، کە ئەویش پێکهاتەیەکی حکوومی یان ئابووری نییە، پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی نێو خەڵکە، لە مێژوودا پێکهاتووە و یەکی گرتووە بەهۆی ناولێنانی گشتی و زەوی

و فەرهەنگ و زمـان و پێکهاتـەی دەروونـی و دابونەریتـە دیاریکراوەکـانی و هـی تر.(١)

ئـەم نەتەوانـە نـاوی تایبـەتیان لـە خۆیـان نـاوە، ئـەو ناوانـەش بـە پێـی گۆڕانکاری و شانبەشـانی چـەندایەتی و چۆنایەتی هاوشـانیدا گـۆڕانی بەسـەردا هـاتووە، لـە کۆنـدا یەکـە هۆزییـەکان یـان پێکهاتـە کۆمەڵایەتییـە بچـووکەکان هەڵساون بە ناونانی خۆیان (یان ناویان لێ ناون) بـە پێـی گەلەوشـە زمانەوانیـە دیاریکراوەکـانی ئـەوکات، وەك ڕەنگدانەوەیـەکی بـۆ چـەمکە سـادەکان، ئـەم چەمکانەش بە زۆری پەیوەسـت بـوون بـە بینـای ڕۆحـی کۆمـەڵگاوە، هەنـدێجار خواوەنـدە گەورەکـەیان ڕۆڵێکـی دیـاری تێـدا دەبینـی، ئەمـەش لـەو قۆناغـەدا دەردەکەوێت کە دەکەوێتە پێش سەرهەڵدانی گەل کوردەوە.

لە کوردستاندا و لە گەڵ سەرەتای چاخە مێژووییەکاندا، ناوانێـك دەرکـەوتن گوزارشـتیان لـە نەتـەوە و یـەکێتی ئـەو نەتەوانـە دەکـرد کـە ڕۆڵـی ڕامیـاری و شارستانی خۆی بینیـوە لـەو ناوچـانەی تێیـدا بـووە یـان لـە دەرەوەی، کـە بـە زۆری زانیاریيـەکانی لـە ڕێگـەی نووسـراوە سـۆمەری و ئەکـەدی و ئاشـووری و ئۆرارتییەکانەوە پێمان گەیشتوون، کە دواتر مێژووەکانیان باس دەکەین.

یـەکێك لـە راسـتییە تایبەتییـەکانی مێـژووی ناوچـەی کوردسـتانی کـۆن، ئەوەیە کە کۆنترین ئەو نەتەوانەی کەدەقـە مێخیـەکان باسـیانی کـردووە گوایـە دانیشتوانی ئەم ناوچانە، لە بنەچەدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ناوچانەی کەوتوونەتـە ڕۆژاوا و باشـووری ڕۆژئـاوای دەریاچـەی (وان)ەوە ئـەم راسـتییەش بـێ گومـان نیشـتمانی راسـتەقینەی ئـەو نەتەوانـەی دیـاریکردووە کـە نیشـتەجێی ناوچـەی کوردستان بوون لەوانەش کورد، ئەم نیشتمانەش وەك زانیارییەکان ئاماژەی بـۆ دەکەن، دوو ناوچەی سەرەکی لە خۆ گرتووە، یەکەم: ناوچەی "سـو"، دووەم:

ناوچـەی "کـردا"(٢)، راسـتی ئـەم زانیارییانـەش لـە رێگـەی ئـەو نووسـینە مێخیانەوە بۆمان ساغبۆتەوە کە پادشا "شوسین" ٢٠٣٦-٢٠٢٨پ.ز چوارەم پادشاکانی نەوەی ئوری سێیەم ٢١١١-٢٠٠٣پ.ز بۆی بە جێهشتووین کە تیایدا ئەم دەقە مێخییەی لە خۆ گرتووە.




( ئیرننا فەرمانڕەوای ناوچەی سو، و خاکی ناوچەی کردا )

KAی کۆتـایی ئـامرازێکی خستنەسـەری سـۆمەریە، چـونکە مـادا -MA DA کە مانای (ولآت، خاك) دەگەیەنێت خراوەتە سەر شاری کردا.(٣)

توێـژەرەوەی "توریـو-دانگـن" ی فەرەنسـی لـە یەکـەمجار باسـی ئـەم دەقـە مێخیـەی کـردووە و Reved, Assyl ologleetd, Archeologle orlentals, 6, 67 بلاوکردۆتـەوە، کەوتۆتـە هەڵەیـەکی بچووکەوە، کـە ئـامرازی خستنەسـەری (KA) بــە بەشـێك زانیـوە لەشـاری KAD-DA بۆیـە نـاوی شـارەکەی بـەم شـێوە خوێندۆتـەوە KAR.DAKA ki، ئـەم هەڵەیـەش کـە (تۆریو-دانگن) تێی کەوتووە، بـە بـێ دەسـتکاری لـە توێـژەری رووسـی (فلادیمێـر مینورسکی)یەوە وەری گرتووە یەکێکی تر لەو بەڵگانەی لـە سـەر ئـەوەی کـە نـاوی راسـتی ناوچـەکە (KAR.DA)یـە، خوێندنەوەکـەی توێـژەری مێخـی (ئیـدزەد) (EDZARD)ە، کە هەمان نـاوی لـە تێکسـتی تـردا بەمشـێوەیە (GAR.TA) خوێندۆتەوە(٤)، بۆ زانیاری، ئەو هێما مێخییەی هـی (GAR)ە، بـە (KAR)یـش

دەخوێنرێتـــەوە، هێمـــای بڕگـــەی (TA)ش، بـــە هـــەمان شـــێوەیە بـــە (DA) دەخوێنرێتـــەوە، کەواتـــە ئـــەتوانین نـــاوی (GAR.TA) بـــە (KAR.DA) بخوێننـەوە بـە بـێ ئـەوەی لـە ڕاسـتی ئـەم نـاوە لامـان دابێـت، سـەرەڕای ئـەوەش پێگەی ناوچەی (GAR.TA) هەمان پێگەی ناوچەی KAR.DAیە(٥).

لە ڕوانگەی ئەوەی پێشتر باسکرا ئێستا ڕوونبۆتەوەکە بنەچـەی ئـەو نەتەوانـەی کە لە لە مێژووی کۆندا لە کورستاندا نیشتەجێ بوون لـە هـەردوو ناوچـەی "سـو" و "کـردا"دا خـۆی دەبینێتـەوە، وەك چـۆن دوورگـەی عـەرەبی بـە نیشـتمانی ڕاسـتەقینەی نەتـەوە ئەکـەدی و بـابلی و ئاشـووری و ئـاموری و کـەنعانی و نەتەوەکانی تری دوروکەی عەرەبی دادەنرێت.

لە خوارەوەش بە پێی زنجیرەی کات ئەو نەتەوانە دەخەینـەڕوو کـە لـە ناوچـەی کوردستاندا نیشتەجێ بوون بۆ ئەمەش پشتمان بەو ئامازانە بەستووە کـە لـە دەقـە مێخیەکاندا هاتووە..

* سوئیەکان

لـە ڕێگـەی ئـەو ئامـازە مێژووییانـەی کـە بەردەسـتکەوتوون وادیـارە کـە سـوئییەکان، واتـە: دانیشـتوانی ناوچـەی "سـو"یە کـە پێشـتر باسـکرا- کـۆنترین دانیشـتوانی ناوچـەی کورسـتانن، ئـەو بەڵگەیـەش کـە ئـەم ڕاسـتییە دەسـەلمێنێ ئەوەیە، نـاوی ناوچـەیٚ (سـوبار SUBAR) کـە بـۆ یەکـەمجار لـە نووسـینەکانی پادشـا (ئـەی ئـەنانم) ٢٤٧٠-٢٤٣٠پ.ز هـاتووە، کـە سـێیەم پادشـاکانی نـەوەی لەکشـی یەکەمـەوە لـە دەوری ٢٥٢٠-٢٣٥٥پ.ز، بـێ گومـان ئـەم نـاوەش لـە (سـو SU)، واتـە: ئـەو نەتـەوەی لـە ناوچـەی (سـو)دا نیشـتەجێ بـوون کـە دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژئـاوای دەریاچـەی (وان)ەوە، هـەروەها لـە ووشـەی (بـار BAR)

پێکهاتووه، کە بە زمانی سۆمەری مانای(دەرەوە) دەگەیەنێت، بەمەش مانای ناوی "سوبار" ئەو سوئیانە دەگەیەنێت کە لە دەرەوەی سنور دەژین.

ناولێنانی (سۆبار) لە دەقە مێخییەکانیشدا لە شێوەی (سۆبارتۆ)دا دەرکەوتووە، لەبەرئەوەی (تۆ) لە لایەن سۆمەریەکانەوە وەکو پاشگرێك بۆ لە کۆتایی شوێنە ئاراستە جوگرافییەکان دادەنرا وەکو: ئۆرارتۆ، مارتۆ و سۆبارتۆ)).

سەبارەت بە سنووری ناوچەی سوربارتۆش، ناتوانین بە دڵنیاییەوە سنووەکەی دیار بکەین، بەڵام هەرچۆنێك بێ دەکەوێتە نێوان شاخەکانی زاگرۆس لە لای رۆژهەڵاتەوە رووباری خاپوور لە لای رۆژئاواوە، هەر بۆیە بە ناوی (سوبارتۆ) لەو ناوچە ئاشوورییە نراوە، باشترین بەڵگەش باسەکەی (مەردۆك پلادان ٧٢١-٧١٠ پ.ز)ە کە لە بابلدا دژ بە دەسەڵاتی ئاشووری راپەری کە وەسفی دووژمنەکەی (سەرگۆن)ی پادشای ئاشوورییەکان بەوە دەکات و دەڵێت پادشای وڵاتی سۆبارتۆیە.(٦)

دەقە مێخییەکان ئەوەی سەلماندووە کە ناوچەی سوبارتو لە هەزارەی سێیەمی پێش زایندا دووچاری داگیرکاری بووەتەوە.یەکەم: لە سەردەمی پادشا "ئەی ناتم" بووە کە پێشتر باسکرا، دوەمیش: سەردەمی پادشا "سەرگۆنی ئەکەدی"، ٢٣٤٠-٢٤٨٤ پ.ز.(٧).

سەبارەت بەو هێرشانەش کە کردوویانەتە سەر عێراق، وادیارە لە کۆتاییەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا لە گەڵ عیلامییەکاندا یەکیانگرتووە بۆ ڕوخانی شاری ئوور، ئەم راستیەش لەو لاواندنەوە بۆمان دووپات دەبێتەوە کە بە (لاواندنەوەی شاری ئوور) ناسراوە، کە نووسەرکەی ئەم ئامازەیەی خوارەوەی باسکردووە.




## سوئییەکان عیلامییەکان، دوژمنان بە( شاری ئوور) گەشتن

ئەم ئاماژەکردنە تایبەتـە بـە داگـیر کردنـی سـوئییەکان و عیلامییـەکان بـۆ شـاری ئـور لـە کۆتاییـەکانی هـەزارەی سـێیەم، واتـا لـە کۆتـایی نـەوەی ئـوری سێیەمدا، جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوان بە تەنها ناوچەکانی سـوباتۆی زێـدی خۆیانیان پێ بەس نەبووە، بەڵکو چاویان لە داگیرکردنی ئەو ناوچانە بـووە کـە دەوڵەتۆکـە سـۆمەرییەکان و ئەکەدییـەکانی تێـدا بـووە، بـەلاّم هێـزی ئـەو دەوڵەتۆکانەی کە باسکران بوونە ڕێگر لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، کـاتێ کـە هەلیان بۆ رەخسا بۆ هێرش کردنە سەر شاری ئور بـە ببڕایـبڕ دوو دڵ نـەبوو، ، بەس نەبوونی سوئییەکان بەو ناوچانەی کە بە دەستیانەوە بوون، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە ناوچـەکە دەسـتهانتێکی خـۆراکی دیـاریکراوی هـەبوو، بـە هـیچ شێوەیەك یارمەتی بنیاتنانی ولاّتێکی نەداوە کە رکابەری دەوڵەتانی سۆمەری و ئەکەدی و بابلی بێت

لە کۆتایی باسی دەقە مێخیە سوئییەکان پێویستە ئامـاژە بـەوە بکـەین کـە ناوچەی سوبارتۆ لە دەقە مێخیە جیاوازەکاندا ببەمشێوازانە هاتوون: سـوبارتۆ، سوبار، سوبیر و شوبور، بۆیە هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان هەردوو ناوی (سـو

و (سوبار)، هەردووکیان بە واتای ئەو نەتوەیە دێن کە دانیشتووی ناوچەی سوبارتۆیە.

* لۆلۆبیەکان

هیچ بەڵگەیەکی مێژوویمان نیە کە ئەوە بسەلمێنێ لۆلۆیەکان لە دەمێکی دیاریکراودا پێش یان پاش سوئیەکان هاتبێتنە ناوچەی کوردستان، دیارە هەردوو گروپەکە هاودەم بوونەو یەك گروپیان نواندووە، دواتر بوونەتە بە دوو بەشەوە، یەکەمیان نیشتەجێی ناوچەکانی باشووری میزۆپۆتامیا بوون و پێیان دەوترا سوبارتۆ، بەشی دوەمیش بە شێوەیەکی گشتی لە دەشتی زەهاو و شارەزوور نیشتەجێبووە بە تایبەتی لە ناوچەکانی دەورووبەری سلێمانی کە لە سەردەمی ئاشوریدا بە وڵاتی زاموا یان مازاموا دەناسرا.
بە ڕای هەندێك، ناوچەکانی نیشتەجێ بوونیان لەوە فراوانتر بووە کە باسکراوە، کە ناوچەکانی نێوان ڕووباری سیروانی لە خۆ گرتووە تا دەگاتە دەریاچەی وان، هەڵدەکشا و دادەکشا بە کاریگەریی هەڵمەتی ئەکەدی و ئاشوور و هەروەها وڵاتەکەیان، پادشا (سەرگۆنی ئەکەدی) لە نووسینەکانیدا وڵاتی لۆلۆبیەکانی بەو خاکانە دیاریکردووە کە دەکەونە نێوان هەردوو ناوچەی (ئۆرونا) و (سینیۆ)ەوە بەو پێیەی شوێنی ناوچە ناوبراوەکە نازانین، بە دڵنیاییەوە سنووری ئەو ناوچەیەش شانیشینێك بووە کە لە ژێر دەسەڵاتی لۆلۆییەکاندا بووە. بەڵام لەوە دڵنیابن کە ناوچەی سلێمانی ناوەڕاستی ئەو ناوچەیە بووە کە نەتەوەی ناوبرا و نیشتەجێی بووە لە هەمانکاتیشدا پایەختی شانشینێك بووە کە بە ناوی خەمازی ناسراوە لە هەزارەی سێیەمی پ.ز، بۆیە ئەتوانین بڵێین لۆلۆبیەکان شانشینی ناوبراویان دامەزراندووە.
لە ڕێگەی یەکێك لەو نامە مێخیانەی کە لە شوێنەواری (ئیبلا- تل ماردیخ ٧٠کم باشووری حەلەب) دۆزراوەتەوە بوونی پەیوەندییەکی دیبلۆماتیان بۆ

دەرکـەوتووە لـە نێـوان ئیـبلا و خەمازیـدا، نـاوەڕۆکی نامەکـە ویسـتی پادشـای شانشینی خەمازی دەردەخات بۆ ئەوەی شانشینی خەمازیەوە سـەربازی بـەهێز و مەشقپێکراوی دەسکەوێت، بەڵام هۆکاری پێویستبوونی بەو سەربازە بـەهێز و مەشقپێکراوانەی بۆ ڕوون نەکردوینەتـەوە بەرامبـەر بـەوەش دە پارچـەناوماڵەی دارینــی و دوو پارچـە خشـڵی بـە بـاڵوێزی شانشـینی خەمازیـدا نـارد بـۆ پادشـا (زیزی)(١).

ناوەڕۆکی ئەم نامەیەش بێ گومان ئـەوە دەگـەینێت کـە هـەردوو شانشـینی ئیبلا و خـەمازی لـە ناوەڕاسـتی هـەزارەی سـێیەمی زایینیـدا سـەربەخۆ بوونـەو هەرەیکەیان ئـازادی بڕیاردانیـان هـەبووە لـەو هەنگاوانـەی لـە گـەڵ شـوێنەکەی بەرژەوەندییەکانیاندا دەنگونجا، لە ناوەڕۆکی نامەکەشـدا هـیچ ئاماژەیـەك نییـە بۆ ئەوە کە هیچیان شوێنکەوتەی دەسەڵاتێکی ڕامیاری دیکـەبن، بـەڵام ئـەوەی کـە زۆرجـار پرسـیار دروسـتدەکات، ئـەو هۆکارەیـە کـە وای لـەم دوو شانشـینە کردووە سەرباری دووری نێوانیان کە بە ١٠٠٠ کم مەزەندە دەکرێت.

سەرباری زانیاریمان بـەوەی کـە وڵاتـان لـە کـۆن و لـە ئێسـتادا هاوپـەیمانی نابەستن، تەنها بۆ پەرپەچدانەوەی مەترسـییەکی هاوبـەش نـەبێ، کـە هەرەشـە لە کیانی ئەو وڵاتە هاوپەیمانانە بکات....

ئـەو زانیاریـە مێژووییانـە لەبەردەسـتان دووپـاتی دەکاتـەوە کـە شانشـینی (کـیش) هەنـدێجار کـاری بـۆ ئـەوە کـردووە هێـزی خـۆی بەرامبـەر بەشانشـینی دراوسێکان دەربخات، ئەوەی کە ئەم ڕاستییە دووپـات دەکاتـەوە، یەکێکـە لـەو دەقە مێخییانەی لە شاری کیش دۆزراونەتەوە باسی ئـەو شـەڕەمان بـۆ دەکـات کە لە نێوان کـیش و خەمازیـدا بـەرپابوو(١١)، دەقێکـی دیکـەش لـە نێـوان ئـەو دەقانەی لە ئیبلا دۆزراونەتەوە ئاماژە بەوە دەکات کە پادشای کیش (میسـالم)

نیازی کۆنترۆڵکردنی ئیبلای هەبووە(١٢)، بەم پێیەش کاری هاوپەمانێتی نێوان هەردوو شانشینی ئیبلا و خەمازی دەرکەوتووە، کە وادیارە ڕێگریکردن لە نەوەی کیش بووە لە سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بە سەریاندا.

بە پێی ئەو خشتە مێخیانەی کە بە خشتەی سەلماندنی پادشاکان ناسراوە، وادیارە کە کیش هەر بەراستی توانیویەتی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بە سەر خەمازیدا، خەمازیش سەربەخۆیی بە دەستنەهێناوە تا دوای رووخانی کیش و گواستنەوەی سەرۆکایەتی بەشی باکووری عێراق بۆ دەستی نەوەی وەرکا، بەڵام ئەگەری گەورە ئەوەیە کە روخانی کیش دەرەنجامی هێرشێکی کتوپڕی لۆلۆبییەکان بووبێ، ئەمەش لە خشتەی سەلماندنی پادشاکاندا وا دەردەکەون، بەڵام پاشماوە شوێنەوارییەکان ئاسەوار باس لە شتی لەو جۆرە ناکات.

دوای ئەوەی کە نەوەی وەرکا جێگیربوون رووبکردە خەمازی و گەراندیەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئەمەش خوێندنەوەی دەقی ئەم راستیانەیە لە خشتەی سەلماندنی پادشاکان.

کیش بە چەك لێدراوە KISI KI GIS TUKUL BA.AN.SIG

پادشایەتییەکەی NAM. LUGAL. BI

بۆ خەمازی گوازرایەوە HA.MA.ZI.SEBA. TUM

لە خەمازی خەتانیش HA.MA.ZIHA.TA.NI.IS

بۆتە پادشا LUGAL.AM

و فەرمانڕەوایەتی کردووە ٣٦٠ ساڵ MU 60 X 6 iAK

خەمازی، لێدرا بە چەك HA.MA.ZI[KI]GIS TUKUL BA.AN.SIG

پادشایەتییەکەی بۆ وەرکا گوازرایەوە

AM.LUGAL.BIUNUG[KI].SE BA. TU

هەروەها شانشینی خەمازی جارێکی تر سەربەخۆیی بە دەستهێناوەتەوە، تەنها دوای ئەوە نەبێت کە سەرگۆنی ئەکەدی دەۆکەوت و، شارە سۆمەرییەکان و هەستانی بە یەکخستنەوەی وڵات، کە ئەوکاتەی سەرقاڵبوونی بە یەکخستنەوەی وڵاتەوە بواری لە بەردەم شانشینی خەمازیدا رەخساند لە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆی، لە سەردەمی پادشا (نەرام سین ٢٢٦٠-٢٢٢٣ پ.ز) کورەزایدا، لۆلییەکان لە سەردەمی حوکمرانییەکان (سوتونی-SATUNI) فەرمانڕەوایان لە گەڵ وڵاتی سیدووری دژ بە پادشا (نەرام سین) یەکیانگرتەوە، وایکرد لە پادشای ناوبراو کە هەڵمەتێکی سەرکەوتوو بباتە سەر ئەم یەککگرتنەوەیە، ئەم سەرکەوتنەشی بە سەریاندا لە سەر نەخشێکی چیایی لە دەربەندی گاور نەخشاند(١٤). ئەمەو وادیارە لۆلۆییەکان دوای مردنی (نەرام سین) رزگاربووبێتن، چونکە بە شارکلی شری ٢٢٢٣-٢١٩٨پ.ز جێنیشنی ئەو هێرشێکی دیکەی کردۆتە سەر وڵاتی لۆلۆییەکان.

خاکی نیشتمانی لۆلییەکان بە ئاراستەی باکووری رۆژهەلات تا ناوچەی هالمان (زەهاوی ئێستا) فراوانتربۆتەوە ئەمەش ئەو تابلۆیە دووپاتیدەکاتەوە کە (ئانووبانینی) پاشان لەو ناوچانەدا دایناوە، سەرباری شێوەی سۆمەری-ئەکەدی بۆ ناوی پادشا، بەلام پێدەچێ ئانووبانینی کە پەیوەندی هەبێت بە خواوەندی عیلامی (هانووبانی، هومبان)ەوە دوور نییە ئانووبانینی داگیرکاری گۆتییەکانی بۆ سەر سۆمەر قۆزتبێتەوە و جەختی کردبێت لە دووبارە کۆنترۆلکردنیان بۆ ئەم ناوچانە لە گەڕاندنەوەیان بۆ زاڵبوونیان بەسەر ئەم ناوچانەدا.

دوای هەڵمەتەکەی نەرام سین بە دەگمەن نەبێ باسی لۆلۆییەکان نابیستین، لە سەردەمی ئاشووریدا، بە تایبەت لە دەمی ئاسوور ناسر پالدا، واتا دوای

نزیکەی دوو هەزار ساڵ، لە بارەیانەوە دەبیستین، ناونیشانیان پەیوەستبووە بە وڵاتی (زاموا)وە، کە چەندین جار کەوتۆتە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەوە، ئەگەری ئەوەش هەیە کە هەندێك لە سەردەمی سەرکردە لولۆبیەکان رۆڵێکی رامیاری گرنگیان بینیبێت لە دەرکەوتنی وڵاتی ئاشووریدا و بە بۆچوونی سپایزەر هەندێك لە پادشاکانی ئەم وڵاتە لە سەدەی دوازدەی پێش زایینیدا بە رەچەڵەك لولۆبی بوون.

سەبارەت بە چۆنێتی ژیانی ئابووری لولۆبیەکان لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا ل٤٦ ئینگلیزی، ئەوا ئەو دەقە ئابووریانەی پێمان گەیشتوون لە شاری کاسوورەوە (دواتر ناوەکەی بووە بە نوزی) ئەوەی بۆ دەرخستین کە ئەوان لە سەر ئاژەڵ بەخێوکردن و بازرگانی کردن ژیاون، واتا گرنگیان داوە بە ژیانی شوارنکاری زیاتر لە ژیانی کشتوکاڵی، چونکە ئەوکات بازرگانان ناوچەی لولۆبییەکانیان بە باشترین بازار هەژمار کردووە.

کاتێك گۆتییەکان دەسەڵاتی خۆیان سەپاندە سەر زۆربەی دەوڵەتۆکە عێراقییە کۆنەکاندا، لولۆبییەکان لە دەسەڵاتی ئەکەدی رزگاربوون، کەچی لە گەڵ ئەوەشدا شتێکی ئەوتۆ نابیستین، واتا لە بارەی شانشینی خەمازییەوە، ئەمەش ئاماژە بەوە دەکات کە هەردوو پادشای ئەکەدی نەرام سین و شارکلی شری تا رادەیەك سنووری شانشینەکەیان لابردووە، سەرباری هاتنی گۆتێکانیش کەوا ناوچەی ژێردەستی لولۆبیەکانی بەرتەسك کردەوە، بۆیە هەر لە کۆتاییەکانی سەردەمی ئەکەدییەوە لولۆبیەکان لە شێوەی گروپی جیاجیادا دەستیان کرد بە ژیان. بە تێپەڕبوونی کات گۆڕا بۆ چەند تیرەیەك بە چەشنێك هەر تیرەیەك خواوەند و فەرمانڕەوای خۆی هەیە.

له دوای نەمانی فەرمانڕەوایەتی گۆتی، گروپە لۆلۆبیەکان دووبارە گەرانەوە ژێر دەسەلاتی ئەو ولاتانەی دوای فەرمانڕەوایەتییەکە دەرکەوتن، دەقەکانی نەوەی دووەمی لەکش ٢١٦٤-٢١٠٩پ.ز ئاماژەی بەوە کردووە کە فەرمانڕەوای نمخانی ٢١١٣-٢١٠٩پ.ز (لو-ننا)ی کوڕی کردۆتە فەرمانڕەوای خەمازی.(١٧)

نووسینەکانی نەوەی سێیەمی ئووری ٢١١١-٢٠٠٣ پ.ز بە تایبەت نووسینەکانی پادشا شوسین ٢٠٣٦-٢٠٢٨پ.ز، چوارەم پادشاکانی نەوەی ناوبراو ئاماژە بەوە دەکات کە (ئیرننا)ی راوێژکاری دامەزراندووە بە فەرمانڕەوایی ئەربیل و میری سەر خەمازی و دانیشتوانی شاری (سو) و هەروەها لە سەر خاکی شاری (کردا).(١٨)

نووسینەکانی پادشا شوسین زانیاری گرنگی بەخشیون لە بارەی پەیوەندی ئەو زمانەی سوئیەکان (سوبارتییەکان) و لۆلۆییەکان قسەیان پێکردووە، کە یەکێك لە دەقەکانی پادشای ناوبراو باس لەو دەکات کە زمانی سوئییەکان و لۆلۆییەکان هاوشێوە بوون و ئەمەش وەرگێرانی ئەو بەشەی دەقە مێخیەکەیە کە تایبەتە بەم راستییەوە:




**ئەوکات دانیشتوانی شاری شوبەر و ناوچەی خەمازی بە زمانی هاوشێوە دواون**

چـونکه وشـەی (خـامون HA-MUN)ی سـۆمەری بـە زمـانی ئەکـەدی (میتخرتو –MITHURTU)لە بەرامبەریدا دێت، ئەم وشـەیەش مانـای ( بـە یەککەیشـتوو– ئاوێتـە)(٢٠) دەبەخشـێت، واتـە (هاوشـێوە) بـە هـەمان شـێوە باسی لۆلۆییەکان گەیشتۆتە مسیریش کە لە سەر زاری هەردوو نەوەی ١٨ و ١٩ هـاتووە، هـەروەها تحۆتمسـی سـێیەم لـە ڕێگـەی باسـکردنی خوریـیـەکان و میتانییـەکان لـە بـاکووری سـوریا(٢١)، نـاوی هێنـاون، سـەرەڕای ئەمـەش لـە سەرچاوە مێخیەکان تاکو پێش ڕووخاندنی نەینـەوای پایتـەختی ئاشـوورییەکان لـە سـاڵی ١٦١٢پ.ز ناوبردنیـان بـەردەوامبووە، کـە نووسـینەکانی پادشـای ئاشووری (تجلات پلێـزەری سێیەم) ٧٤٥–٧٢٧پ.ز باسـی لۆلۆبیـەکانی تیـادا کراوە(٢٢).

ئـەو ئامازانـەش بۆمـان دووپاتدەکەنـەوە کـە لۆلۆبیـەکان لـە دوای نـەمانی فەرمانڕەوایەتی گۆتی، دابەشبوونەتە سەر چـەند گروپێکداڵەوانـە ئـەو ئامـاژەی کە لە یەکێ لەو ناوانـەی ئاراسـتەی پادشـای خۆرییـەکان (کـواری KWARI) کرابـوو لـە شوشـرا (شمشـارەی ئێسـتا) کـە تیایـدا (شـیپراتۆ–sepratu)ی نووسـەری نامـە بـاس لـەوە دەکـات کـە پادشـا لۆلۆییـەکان (نـەك یـەك پادشـا) دەناڵێنن بە دەست کەمی دانەوێڵەوە، بۆیە ئەوان دەستپێشخەر ئەبن بۆ ئاشتی لـە گـەڵ پادشـا (شوشـرا)دا(٢٣)، ئامـاژەکـەی تـر کـە دابەشـبوونیان بـۆ چـەند تیرەیەك دەسەلمێنێ، لە سـەر زاری پاشـای ئاشـووری تجلات پلێـزەری یەکـەم ١١١٤–١٠٧٦پ.ز هـاتووە، تیایـدا هـاتووە کـە (٢٥) خواوەنـدی لۆلۆییـەکانی بردووە و دابەشی کردووە بە سەر پەرستکا ئاشوورییەکاندا.(٢٤)

ئەوان لە نووسـینەکانی ئـەرابخادا (کـەرکووکی ئێسـتا) بـەناوی (لۆللـۆ) یـان (نوللـو) ناسـراون، کـە مانـای شـاخاوییەکان دەبەخشـێت یـان دانیشـتوانی ئـەو

شاخانەی کە کۆیلەکانی لێوە دێت(٢٥)، بەڵام دواتر ئەو ناوەی کە لە زمانی خەلدیدا (ئۆرارتیدا) مانای بێگانە یان بیانی دەبەخشێ هەروەها دوژمنیش.(٢٦)



کەچی شێوازی کۆنی ئەکەدی ناوی (لۆللۆپوم LULLUPUM) کە لە ئاشوورییە گۆڕا بۆ شێوەی (لوللومی) بە بێ بەکارهێنانی ئامرازی خاوەنداریتی سومەری تاك و کۆ (پ-P)، لە زمانە خۆجێی و عیلامیەکان ئاماژە بەوەدەکات کە پەیوەندیەکی هەیە بە عیلامی و سۆمەری و دیالێکتێکە هاوشێوەکانی(٢٧)، ئەم راستییەش ئەو پەیوەندییە بەهێزە ڕەتناکاتەوە کە لۆلۆبیەکانی لە رووی زمانەوانی یان شارستانیەتەوە دەبەستەوە بە دانیشتوانی دێرینی کوردستانەوە، وەك گۆتییەکان و خورییەکان، بە تایبەت ئەگەر بزانین مەڵبەندی ئەوان دەکەوێتە چەند ناوچەیەکی نزیك لە یەکترەوە، وەك نشینگەکانی نوزێی خوری و ئارابخای گۆتی و بابیتی لۆلۆبی کە هەموویان لە دەوروبەری کەرکووکی ئێستادان، ئەمە سەرەڕای بڵاوبوونەوەیان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان کە ئەو بەڵگە مێژوویانە دووپاتی دەکەنەوە، کە دەگەڕێنەوە بۆ دەمی داگیرکردنی عیلامییەکان بۆ ئەم ناوچانە لە سەر دەمی پادشای ئەکەدی شارکلی شرا لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا.

پێش ئەوەی بچینەسەر راستی ناولێنانی لۆلۆبیەکان، پێویستە باسی ئەوە بکەین کە ئاینی و فەرهەنگ و زمانی ئەکەدی کاری زۆری تێکردوون، بە چەشنێك بەرهەمی نوسینیان بە زمانی ئەکەدی بووە بگرە ناوی هەندێك لە پادشاکانیان ئەکەدی بووە، باشترین گەواهی بۆ ئەوەش ئەو میلەیە(مەسەللە)یە کە (ئانووبانینی) پادشای لۆلییەکان بۆی بەجێهێشتووین لە سەرپێڵ زەهاو، کە ئەوە زمانی ئەوە و زمانێکی ئەکەدییە(٢٨)، خودی ئانووبانینی ناوێکی ئەکەدییە مانای خواوەند ئەنو (خواوەندی ئاسمان) دروستکەری من دەبەخشێت.

**بنچینەی ناوی لۆلۆبیەکان:**

ئەگەر تەماشای ئەو دەقە مێخیانە بکەین کەباسی لۆلۆبییەکانی کردووە، ئەبینین کە ناوەکەیان تەنها بە دووشێواز هاتووە، LU...LUB هەروەها LULUBUM، دووەمیان LU.LU، ئەم دووجۆرە ناوەش دراوەتە پاڵ زمانێکی نادیار، کە توێژەی مێخی ئەمریکی گیلب GELB، پێی وتووە BANANA LANGUAGE (٢٩)، بەڵگەیەکی تریش بۆ ئەوەی کە ئەو ناوانە دراونەتە پاڵ زمانی (بەنانە) ئەوەیە ناوە لۆلۆبییەکان، لە وەرگێرانی ئەو دەقە مێخیە ئەکەدیانەوە دەردەکەون کە ئەو ناوانەی تێیدا دەرکەوتووە، چونکە ئەکەدییەکان یەکەم کەس بوون کە زاڵبوون بەسەر وڵاتی لۆلۆبیەکاندا، بۆیە دیلێکی زۆریان لە گەڵ خۆیاندا هێنا، بۆیەش دەبینین کە زۆربەی ئەو ناوانەی دەرکەوتوون لە سەر زمانی (بەنانا)ن کەنیزن یان کۆیەلەن، چونکە دیلی شەڕەکان لە کۆندا دەکران بە کۆیلە. هەرچۆنێك بێت ناوی ناسراوی لۆلۆبی هەن ئەتوانێت یارمەتیمان بدات بۆ ئەوەی بڕیار بدەین ئەم زمانە بۆ چە گەلە زمانێك ەدەگەڕێتەوە هەروەها دەنگەکان و زاراوەکان لەم شوێنەوارە زمانەوانییە لۆلۆبییەدا بەسە بۆ ناسینەوە و روونکردنەوەی.(٣٠)

ئەتوانین بڵێین ئەو پاشکرانەی دەکەونە کۆتایی ئەم ناوانەوە لە زمانی عیلامیشدا بەدی دەکرێن وەك ك، ر، س، بگرە ئەو "(أ) ن"یش لە گەڵ پیتە بزوێنە هەڵواسراوەکان یان بە بێ ئەوان بەکاردێت، هەروەها لە گەڵ پیتە نەبزوێنەکاندا وەك (پ، P) کە هێمایەکە بۆ کۆ.(٣١)

نموونەش لە سەر ئەوە شاخەکانی (سیم–ئەکی) لە وڵاتی زاموا، هەروەها زنجیرە چیای (ئاز–یرو)ش لە ئێستادا پێی دەوترێت (ئەزمەڕ) لە نزیك سلێمانی.

له لایەکی ترەوە پیتی (ر) لە کۆتایی هەندێ لە ناوەکاندا دەردەکەون وەکو ناوی زنجیرەیەك لە چیاکان کە زۆرجار لە تۆمارە ئاشوورییەکاندا دووبارە دەبێتەوە وەکو (کولل–ار) وەك بڵندترین شاخی وڵاتی (لۆلۆمو) هەروەها لە شێوەی وڵاتی (زاموا)ش هاتووە، تابلۆی ئانووبانینیش لە سەر شاخی (بات–یر) دروستکراوە وەك چۆن لە خودی تابلۆکەدا هاتووە، رووباری (ئید–یر) و شاری (زام– ری) و (با– ری)یش هەیە لە تەنیشت ناوچەی (لا–رە) و شاخی (لا–لار) و تەنگەبەری (هاشو–ار) جگە لەمانەش هەیە.(٣٢)

له راستیدا ئەم جۆرە ناوانە بە هەمانشێوە لە ناوچەکانی (باراهس) بەدی دەکرێت کە دەکەوێتە باشووری وڵاتی لۆلۆبییەکان و باکووری عیلام (ناوچەکانی خورەم ئاباد و کرماشانی ئێستا) لە گەڵ ئەوەشدا ناوی لۆلۆبی لە جۆرێکی دی بەدی دەکەین وەك (ئۆزی– قەڵای بابید– بازیانی ئێستا– بوناسی– شاری هۆدون– شاخی سو– ئەنا– رووباری راد– ئەنو– وڵاتی هالما–ن یان ئارام... ن ا یان ئالم – ا ن یا لم– ا ن (حەلوانی سەردەمی ئیسلامی). بەو پێیە سپایزەری پسپۆری ئەمریکی پێی وایە کە ناوی هەردوو رووباری زاب (زا–با) یان بە زیادکردنی پاشگرێك لەم زمانە (زا–بان) مانایەکی زمانەوانی لۆلۆبی دەبەشخێت وەك ناوی چیای بەناوبانگ (کینی–با)ی. ئەو شاخە کەلای ئاشوورییەکان بە (نیسیر) دەناسرا، کە پێدەچێ پیرەمەگرونی ئێستایە.(٣٣)

ئەمەو زانیارییەکان ئەو دەسەلمێنن لە ناوچەیەك هەیە ناوی (لۆ–لۆ)یە، بەلاّم لە گەڵ ئەوەشدا پێمان وایە سەرکردەی لۆلۆبیەکان ناوی (لۆلۆ) بووە و، ناوچەی (لۆلۆ)ش دەگەڕێتەوە بۆ ناوەکە ئەو، چونکە (لۆلۆبی– LULUBI) بە زمانی سۆمەری ئەو کەسانە دەگرێتەوە کەسەر بە (لۆ–لۆ)ن، چونکە (بی– B)راناوی خاوەندارێتی کەسی سێیەمی تاك و کۆیە.(٣٤)

ناوی (لۆ-لوبو LULUBUM)یش شێوازێکی ئەکەدیە لە ئامراوی ناسراوی (UM) ەوە پێکهاتووە و چووەتە کۆتایی وشەکە، کەواتە ناوی لۆلۆییەکان یان دەگەڕێتەوە بۆ ناوی سەرکردەکەیان یان دراوەتە پاڵ ئەو ناوچەیەی لە دەروبەریدا بلاوبونەتەوە، وەك چۆن لە گەڵ سووبیەکان (= سوبارتیەکان) و گۆتییەکان تێبینی دەکرێت.

لۆلۆبیەکان لە ولاتەکەیاندا کۆمەڵێك شوێنەوار و کاری هونەریان بە جێهێشتوەوەتەوە کە بەڵگەن لەسەر ئاستی شارستانییەتییان، پاشان لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا بە هونەری بیناسازی ناویان دەرکردووە، هەر بۆیە ئاشوور ناسر پالی دووەم (٨٨٢-٨٥٩پ.ز) ژمارەیەکی زۆری لۆلۆییەکانی هێنا بۆ ولاتەکەی کە لەوێ بە بیناسازیی و پەیکەرتاشی باش ناسران، لەو ولاتەشدا ژمارەیەك بیناو پەیکەریان دروستکرد.

لە دەربەندی رامکان نزیك سەرچاوەکانی رووباری زێی بچووك باشووری رۆژهەلاتی رانیەو لە هۆرێنی شێخان و چەند ناوچەیەکی تری کوردستاندا شوێنەوار هەیە بەڵگەیە بۆ کارە هونەریەکانی ئەوان.

بەڵگە و تۆکارە ئاشوورییە کۆنەکان زۆرجار باسی لۆلۆبیەکان ناکات لە گەڵ گۆتییەکان و کاسییەکان و سۆبارتییەکاندا نەبێت، بەلام دوای ماوەیەکی زۆر لەو سەردەمەوە دەبینین کە پادشاکانی ئاشووری وەك تجلات بلەسەر و حەدد نیرای و تۆکۆلتی نینورتا بە تەنها لە گەڵ لۆلۆبیەکاندا بە شەڕهاتوون، هەروەها ئاشووڕناسر پالی دووەم لە نێوان ٨٨٤-٨٨٠پ.ز، چوارجار داویەتی بەسەر ولاتی لۆلۆدا لە جاری یەکەمدا یەکێك لە سەرکردە لۆلۆییەکان کە ناوی (نور حەدد)ە لە دەسەلاتی ئاشووری هەڵگەڕاوەتەوە، سوپای ئاشووریش هاتۆتە ناوەوە بۆ سەر کوتکردنی ئەم یاخیبوونە لە ولاتی لۆلۆدا لە نزیك دەربەند

بازیانی ئێستا کە ئەوکات پێی دەوترا (بابیت) ئەم دەربەندەش بە شورایەك دەوردرابوو، ئاشوورییەکان شاخەکانی دەوروبەری شوراکەیان گرت و دابەزینە پشت دەربەندەکەوە ئەوکات بە قوربانیدانێکی گەورەوە دەستیان گرت بە سەر ناوچەکەدا لەوانەش شارە بە ناوبانگەکانی وەك بابیت و دەغار و گاگری و چەند شارێکی دیکەش.(٣٦)

لە شاری (زیمرا) مەڵبەندی شانشینی لۆلۆییەکان و لە کاتی داگیرکردنی لە لایەن ئاشوورییەکانەوە، پادشا (ئامیخا)ی لۆلۆ بەرەو شاخەکان کشایەوە، بە ڕای (ئۆلمستید)سەکردە و سەربازە لۆلۆییەکان شاخی کینیبا (نیسیری ئاشووری) یان کردە پەناگەی خۆیان. لە دوایدا سوپای ئاشووری بە سەرکردایەتی (شلمناسر)ی جێنشین هەستا بە هێرش کردنەسەر ئەوانەی خۆیان لەو شاخە سەکەشەدا حەشارداوە کە ئێستا بە (پیرەمەگرون) دەناسرێت. کەچی بۆ یەکەمجار هێنانەدی ئامانجەکەی شکستی هێنا و بە تەواوەتی لەناوبرا، بۆیە وادیارە ئاشوورییەکان ئاشتەواییان لە گەڵ ئەو بەرهەڵستارانەدا کردووە، سەرەڕای ئەوەش ئاشورناسر پاڵ هەواڵی ئەم بەسەرهاتانەی تۆمار کردووە و مینومینتێکی تایبەتی بۆ دروستکردووە لە پاڵ هەردوو مۆنۆمێنتی تجلات پلیسەر و تۆکۆلتی نینورتادا. بەهەمانشێوە شەلمانسەری دووەمیش ساڵی ٨٥٩ پ.ز هێرشی کردۆتە سەر وڵاتی زاموا و دەستی بەسەراگرتووە تاکو شاخەکانی نیکدیم و نیکدیارا، لە ساڵی ٨٤٤پ.ز ئەم پادشایە جارێکی تر هێرشی کردۆتەسەر (نامری) و لە ڕیشەوە بەرە و وڵاتی زاموا، پادشای هەرێمی نامری کە ناوی (مەردۆك مۆدامق) بوو ناچاربوو لە شاخەکاندا خۆی مەڵاسدا، هەروەها شەلمانسەری دووەم ساڵی ٨٢٩پ.ز هێرشی کردۆتە سەر کرخی و کردویەتی بە وێرانە، دوای ساڵێك لەم هێرش

کردنــه هــەواڵی زامــوا (وڵاتــی لۆلۆبیــەکان) وەك هــەرێمێك لــە هەرێمــەکانی ئیپراتۆریەتی ئاشووری پێمان دەگات.(٣٧)

ئیتر بەم چەشنە وڵاتی لۆلییەکان گۆرەپانێك بووە بۆ راپـەرینی نـاوخۆیی و هەڵمــەتی ســەربازی ئاشــووری تــاکو کۆتــایی فــەرمانڕەوای ئاشــووری لــە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتـەمی پ.ز ئینجا هـۆزە میدییـەکان هاتنـە ناویـەوە و پادشــا (کــەی ئەخســاریش) لــە کــاتی هەڵمەتێکیـدا بـۆ ســەر نەینــەوا پێـدا رۆیشتووە، هەندێ شوێنەواری میدی لە ناوچەکانیدا دەبینرێت لەوانەش تـابلۆی ئەشکەوتی قزقەپان.

## گۆتییەکان:

گۆتییەکان لەو ناوچەیە ژیاون کە دەکەوێتە باشووری دەشـتی شـارەزوور، واتـە ناوچەی نێوان رووباری زێی خوارو و رووباری سیروانەوە، ئارابخـا (کـەرکوك)ی ئێستاشیان کردۆتە مەڵبەندی خۆیان. بەڵگەنامە مێژوویەانی هـەزارەی سـێیەم و دووەمی پێش زایین ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم ناوە لەو خەڵکانە نـراوە کـە لـە رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتی لۆلۆبیەکاندا نیشتەجێبوون، دواتریش بـە واتـای ئەو هۆزە جیاوازانەی گەیاندووە کە لە ناوچەکانی بـاکووری و رۆژهـەڵاتی بابلـدا دەژیـان. لـە هـەزارەی یەکـەمی پـێش زایـن ئۆراتییـەکان مەبەسـتیان لـەم نـاوە دانیشـتوانی وڵاتــیماننـا و میـدیا بـووە. کەچـی نـاوی گۆتییـەکان لـە تۆمـاری سەرگۆنی دووەمـی ئاشـووریدا هەنـدێجار بـە جیـا لـە میـدیا ئێرانییـەکان تۆمـار کراوە.

یەکەم پاشا لەو پادشـا گۆتییانـەی کـە نـاوی لـە نووسـینە مێخیەکانـدا هـاتووە (ERRIDUPIZIR)ە، کە هاوچەرخی پادشای ئەکەدی (نەرامسـین) بـووە، وادیارە بۆ ماوەیـەکی کـورت کـۆنترۆڵی شـاری (نفـەر)ی کـردووە و نووسـینێکی

زۆری تیادا بە جێهێشتووە باسی خۆی تێدا دەکات کە پادشای هەرچوار ئاراستەکەیە.

یەکێکی تر لەو پادشا گۆتییانەی دەقە مێخیەکان باسیکردوون پادشای چوارەمە کە هاوچەرخی پادشای ئەکەدی شارکلی شرای بووە ٢٢٢٣-٢١٩٨پ.ز و ناوی (سارلەگاب-SAR-LAGAB )ە، کە لە نووسینەکانی شارکلی شرای دا بە شێوازی (SARLAG) هاتووە، ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەم پادشایەش ماوەی مەترسی بەردەوامی وێنادەکرد بۆسەر ئیپراتۆرریەتی ئەکەدی، ئەوەش بە پێی گوزارشتی یەکێك لە نامەکانی سەردەمی پادشای شاکلی شرای، هەربۆیە پادشای ناوبراو هەڵمەتێکی سەرکەوتووی کردە سەر ناوچەی گۆتییەکان و (پادشا سارلەگاب)ی تیادا بەزاند. پادشایەکی تر کە دەقە مێخیەکان ناوی بردووە، پادشای شەشەمە ناوی ( ELU, LU.MES)ە، کە توانی دووبارە هەرەشە لە کیانی ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی بکا و سەرەڕای ئەوەش وارێکدەکەوێت لە سەردەمی ئەودا پادشا شاکلی شرای بمرێت، هەروەها هاتنی چەند پادشایەك کە لە ناو خۆیاندا ململانێیان دەکرد بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، ئەمەش وایکرد پادشای گۆتی (ئیلۆلۆمیش) بتوانێت وڵاتی ئەکەدی بڕوخێنێت و نازناوی (پادشای بەهێزی ئەکەد) لە خۆی بنێت.

ئەمەو ئەو زانیاریانەی لە بەردەستدان لە سەر گۆتییەکان دووپاتی دەکەنەوە کە کۆنترۆڵ کردنیان بۆ عێراق تەنها بەشەکانی باکووری گرتۆتەوە نەك باشوور، هەمان زانیاری ئەوە دووپات دەکاتەوە کە گۆتییەکان لەوێرانە زیاتر هیچی تریان بەجێنەهێشتووە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا کاریگەر بوون بە شارستانیەتی کۆنی عێراقی بە چەشنێك نووسینی مێخی و زمانی ئەکەدیشیان لەوانەوە وەرگرتووە.

بە بۆنەی ئەوەی فەمانڕەوایەتی گۆتی تەنها لە سەر بەشەکانی باکووری عێراق بووە و نەچوونەتە باشووریەوە، ئەوا زۆربەی ئەو شتانەی وەریان گرتووە لە

دیـاردە شارسـتانییەتیەکانی ئەکـەدین. تـا بگـرە ئـەو خواوەندانـەی وەك خواوەندی عشتار و خواوەند سین، خواوەندی مانگ هـەردووکیان لـە خواوەنـدە ئەکەدییەکانە نەك سۆمەری.

کاریگەریی گۆتییـەکان بـە ئەکەدییـەکان لـە رووی شارسـتانییەتەوە لـە نیـوەی دووەمی ماوەی فەرمانڕەواییان پاڵی پێوە نـان نـاوی ئەکـەدی لـە خۆیـان بنـێن وەکو LBRAENUM, HABIL-KAN, KURUM, SIUM, PUZUR-SIN, HABLUN. هەندێجاریش نـاوی لێکداورویان لـە خۆیـان نـاوە لـە هـەردوو زمـانی گـۆتی و ئەکـەدی LAERIBUN, MES-LU-E.(٣٨)

ئەو ماوەیەی کە گۆتییەکان فەرمانڕەوایان تیـا کـردووە بـە نزیکـەی سـەد سـاڵ مەزەنـدە دەکرێـت، بـەڵام ژمـارەی ئـەو پادشـایانەی فـەرمانڕەواییان کـردووە سەرچاوەیەکی راستمان نییە سەبارەت بە ژمارەیان، تەنها خشتەی سـەلماندنی پادشاکان نەبێت ئەویش گومان هەیە لە دروستی هەواڵەکانی کە دەڵێـت بیسـت و یەك پادشان.

## بنچینەی ناونانی گۆتییەکان:

لە کـاتی پشـت بەسـتن بـە یاسـا دەنگییـەکانی زمـانی سـۆمەری بـە ڕوونـی بۆمـان دەردەکـەوێت کـە نـاوی KU-TU واتـە گۆتییـەکان لـە نـاوی ئـەو ناوچـانەوە جیابووەتـەوە کـە لێیـەوە هـاتوون ئـەویش باشـووری ناوچـەی (کردا)یە، کە سۆمەرییەکان وا ڕاهاتبوون لە بەردەم نـاوی شـارەکاندا ئـەو هێمـا مێخیـە دابنـێین کـە بـە (URU) دەخوێنرێتـەوە و مانـای شـار دەبەخشـێت، هـەروەها زیـادکردنی (KI) لـە دوای ناوەکـەوە سـەبارەت بـە ناوچـە و شـارە باکوورییـە شـاخاوییەکانیش لـە جیـاتی (URU) پـێش نـاوی شـار و

ناوچەکانەوە (KUR) یان داناوە. وشەی کوریش بە مانای شاخ یان خاك دێت، بۆیە ئەبێت سۆمەریەکان هێماکەیان لە پێش ناوچەی (کردا) دانابێت بەوەش ناوەکە بەم شێوەی لێهاتبێت KAR.DAKI و بە کاریگەری پیتە بزوێنەکانی تایبەت بە شاری (کردا) بە پیتی (U)ی ناو وشەی (کور)، ئەوا ناوی شار لە ماوەی ئەکەدی لە لایەن شۆمەرییکانەوە بەمشێوەیە خوێندراوەتەوەKURKUR. DUki

یەکێکی تر لەو یاسا دەنگییە سۆمەریانە، هەر بڕگەیەکە بە پیتی نەبزوێن کۆتایی بێت، پیتە نەبزوێنەکە نامێنێت ئەگەر لە دوایەوە بڕگەیەکی تربێت بە هەمان شێوە بە پیتێکی نەبزوێن دەست پێدەکات، بەو پێیەش ناوی شارەکە وای لێدێت KU.DUKI(KUR) ئاشکراشە کە ئەکەدییەکان هەموو (D)یەکی سۆمەرییان گۆڕیوە بۆ (T)(٣٩). بۆیە وشەکە لە زمانی ئەکەدیدا وایلێهاتووە KU.TU لە بەر ئەوەی زمانی ئەکەی زمانی رامیارێتی و کلتوری سەردەمی گۆتییەکانی دەنوانددوە. بۆیە ناویان لە شێوەی KU.TTU وتراوە. ناوی ولاتەکەشیان لە پاڵ سوبارتۆ عیلامدا لە تۆمارەکانی لۆگال- ئەنامندۆی پادشای شاری ئەدەب (تەل بەسمایە)دا لە شێوەی (گۆتیۆم)دا هاتووە.

بە پێچەوانەی مێژووی لۆلۆبییەکانەوە ئەتوانین راستەوخۆ هەندێك لە قۆناغەکانی مێژووی کۆنی گۆتییەکان بزانین، چونکە ئەمان سەرباری ئەوەی ناوی پادشاکانیان لە ولاتی سۆمەر و ئەکەدا تۆمار کردووەباسو خواسی زیاتر لەسەدەیەکی فەرمانڕەواییەتیان لەو دوو ولاتەدا تۆمار کردووە بارودۆخی رامیاری، سۆمەریەکان بارودۆخی ئەو کاتەیان بە نەناسینەوەی پادشا وەسف کردووە (a-ba-am lugal a-ba-amnu lugal) لە دەقە

ئەکەدییەکەش بەمشێوە هاتووە ( ma-nu-um sarrum ma-nu-um lasarrum) واتە ئەوەی پادشا بووە و ئەوەی پادشا نەبووە.(٤٠)

ئەم نامۆیەش لە باردۆخی رامیاریدا لە دیدی سۆمەرییەکان و ئەکەدیەکاندا لە بوونی ئەو جیاوازیەوە دێت کە لە نێوان ئەو کۆمەڵگای شوانکاری گۆتی زاڵبووی جیاوازدا سەر دەسەڵاتی رامیاریدا و لە نێوان ئەو کۆمەڵگا کشتوکاڵییە چینایەتییەی لە وڵاتی شارە سۆمەری و ئەکەدییەکاندا باوبوو، پەیوەندی ئابوورییەکان لە هەردوو کۆمەڵگای جیاوازدا پەیوەندییە رامیارییەکانی هەردوو کۆمەڵگا دیاری دەکات، بۆ نموونە سەرکردەی یەکێتی هۆزگەری گۆتی بۆ ماوەیەکی کورت هەڵدەبژێردرا بۆ بەرێوەبردنی کاروباری سەربازی و رامیاری لە ئەنجوومەنی پیراندا، بە پێچەوانەی پادشای سۆمەری و ئەکەدییەوە کە بە درێژایی تەمەن فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، بە پێی ئەو باوەڕەی کە پادشایەتی لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیوەتە سەر زەوی، لێرەدا شایەنی باسە کە ئەو کێشە رامیارییانەی لەو وڵاتەدا ڕوویداوە لە سەردەمی پادشای ئەکەدی شارکلی شراوە دەستپێکردووە، بەهۆی فەرمانڕەوایەتی گۆتییەکان یان کورتی ماوەکەی نەبوو، چونکە فەرمانڕەوایەتێکە بەهێزبوو و باجەکانیش لە هەموو ناوچەکان بەرێکوپێکی وەردەگیرا، ئارامیش باڵی کێشابوو بە سەر هەندێ لە قۆناغەکانی ئەم ماوەیەدا، هەروەها کورتی ماوەی فەرمانڕەوایەتی هەر پادشایەك لە سەردەمی پادشای دووەم تاوەکو حەوتەم بووە، کە هەر یەکەیان شەش ساڵ فەرمانرەوایەتی کردووە (جگە لە ئینما باکیش کە پێش تەواوکردنی ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی مردووە) دوای ئەو (ئەیار لەگب)هاتووە، کە بیست و پێنج ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، دوای ئەمە پادشاکان لەم ماوەیەدا زیاتر فەرمانڕەوایەتیان کردووە تا گەیشتووەتە

سی ساڵ، بەڵام پادشای سیازدەیەم وچواردەیەم و پانزدەیەم ماوەی کەمتر لە دووساڵ فەرمانڕەوایەتیان کردووە و لە دوای شانزەیەمەوە جارێکی تر ماوەی فەرمانڕەوایەتی درێژ بۆتەوە. لە گەڵ ئەوەشدا هەندێ لە پۆستە بەرزەکان لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی گۆتیدا بە دەستی میرەکانی سۆمەری و ئەکەدیەوە بوو، لەوانەش سوپا وەك (نابی ئەنلیل و ئور — نینازۆ)کەچی زۆرینەی سەربازانی سوپا — بێگومان — لە تاکەکانی هۆزە گۆتییەکان بوون، سەلماندنی پادشا سۆمەریەکان بیست یان یست و یەك پاشای بۆ گۆتییەکان تەرخانکردووە، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەماندا ناوی چوار پادشای ئەکەدی تۆمارکراوە لە دوای دەستەواژەی (ئەوەی پادشابوو و ئەوەی پادشا نەبوو)ەوە تەنها بەناو فەرمانڕەوایەتیان کردووە، دوو پادشاش هەیە لە دوای ئەوان هاتوون و تارادەیەك ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایەتیان کردووە.

سۆمەریەکان و ئەکەدیەکان ئەم سەردەمەیان بە سەردەمە تاریکەکانی مێژووی رامیاری وڵاتەکەیانیان داناوە، بەو پێیەی فەرمانڕەواییان لەوێ گشتی و گشتگیر نەبووە، نەیانتوانیوە کۆنترۆڵی هەموو بەشەکانیان نەکردووە و پێش ئەوەی دوا پادشایان لەناوبەرن کۆنترۆڵکردنیان بەرەو داکشان دەچوو، بەڵگەی ئەوەش سەلماندنی پادشاکان باس لە نەوەیەك دەکات کە دوای سەردەمی ئەکەدی فەرمانڕەوایەتی (وەرکا)ی کردووە و هەندێك لە پادشاکانی هاوچەرخ بوون لە گەڵ ماوەی فەرمانڕەوایەتی گۆتیەکاندا.

هەروەها لە (لەجش)دا نەوەیەك لە فەرمانڕەوا سۆمەریەکان هاتنەکایەوە و هەندێك لە فەرمانڕەواکانی هاوچەرخی ماوەی ئاماژە پێکرابوون و لە دوای

خۆیـــان دەقـــی تۆمارکراویـــان بـــە جێهێشـــتووە لەوانـــە (ئـــور-بابـــا) کـــە فەرمانڕەوایەتییەکەی هەتاوەکو شاری (ئور)یش درێژەی هەبووە.

لـــە کۆتاییـــەکانی ســـەردەمی گۆتیـــدا، یـــەکێك لـــەو مـــیرە ســـۆمەرییانەی فەرمانڕەوایـــەتی شـــاری (وەرکـــا)ی دەکـــرد نـــاوی (ئوتـــو-حیکـــال)ە، دەقێکـــی مێژوویی بۆ تۆمارکردووین تیایدا باسی ئەوە دەکـات چـۆن توانیویـەتی کۆتـایی بێنـــێ بـــە فەرمانڕەوایـــەتی گۆتییـــەکان لـــە ولاّتـــی ســـۆمەردا لـــە دوای ئـــەوەی جـــەنگاوەرە ئوروکیـــەکانی کۆکردۆتـــەوە و بـــووە بـــە ســـەرکردەیان، دەقەکـــە ئـــەڵێت: "ئوتـــو-حیکـــال گۆتیـــەکانی لـــەناوبرد، مارەکـــانی شـــاخ و دوژمنـــانی خوداوەند و ولاّتیان پڕکرد لە خراپە...هتد" لە ڕۆژی شەشـەمدا لـە گـەڵ هێـزی پادشای گۆتی (تریکان)دا بە یەککەیشتن و سەرکەوت بەسـەریدا، ئـەم پادشـایە تەنها چل ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی کردووە.

تێکچـوونی سیســـتەم بـــە شـــێوەیەکی گشـــتی لـــە ســـەردەمی گۆتیـــدا بـــە بۆچوونی خەڵکی ولاّت هۆکارەکان دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئـەو جیاوازییانـەی لـە نێوان ئەو سیستەمە چینایەتییە شارستانیە کشـتوکاڵیەی لـە ولاّتـی سۆمەر و ئەکەدی گەشەی کردبوو، لە گـەڵ تێڕوانینـی دەوڵـت بـۆ کۆمـەڵگا و هەڵوێسـتی تـاك بەرامبـەر بـەو یاسـایانەی ئـەو پادشـایانە دایـدەنێن کـە نوێنـەری چـینە باوەکـانن کـە پیـاوە ئایینیـەکانو زەیوانـەکانی پەرسـتگاکان پشـتگیریان لێ دەکەن، و لە نێـوان سیسـتمی شـوانکاری هۆزگـەری کـە هێشـتا کـە کۆیلایـەتی نەناسیبوو، بۆیە لەم سـەردەمەدا بـۆ نموونـە کۆیلـەکان ئـازادکران، زۆربەشـیان لە گۆتییەکان لۆلبیەکان بوون، بۆ هیچ هۆیـەك نـەبوو تـەنها ئـەوە نـەبێ پادشـا گۆتییـەکان سـەرۆك هۆزانێـك بـوون لـە گـەڵ تاکـەکانی کۆمـەڵگادا کۆمـەڵێك پەیونـدی نـا ئـابووری پێکـەوەی دەبەسـتن، لەوانـە پەیوەنـدی خـوێن و زمـان،

پەیوەندیـە ئابووریـەکان لای ئـەوان نەگەشـتووەتە ئاسـتی پێویسـتکردن بـە زۆرکردنـی وزە مرۆییـەکان بـە زیـادکرنی تاکـەکانی چـینی کۆیلـە. ئەمـەش لـە کاتی خۆیدا بارگرژی بوو لە بەها باوەکـانی ئەوێـدا، لـە لایـەکی تـرەوە زۆربـەی ئـەو کێشـەو ململانێیانـەی روویـدەدا لـە نێـوان سـەرۆك هـۆزە گۆتییەکانـدا بـۆ بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی رامیاری ئەو ولاتە بووە بۆیـە بـوو بـەهۆی نـەبوونی سـەقامگیری و دڵنیـایی لـە نـاو ئـەو شـارە سـۆمەری و ئەکەدیانـەی دەسـتیان گرتبوو بەسەریا، سەرباری جیاوازی لـە پەرسـتراوەکانداکە بـوو بـەهۆی ئـەوەی دانیشتوانی وڵات وەکو ئەژدیها و ماری شاخان تەماشای ئەو گۆتیانـە بکـەن لـە دوای ڕووخاندنیان بۆ ئەو پەرستگا ناوخۆیانەی بۆنیادی شارەکان بوون.

سەبارەت بە زمانی گۆتی، ئەوانەی دەربارەی دەیزانین بـە زۆری لـە ڕێگـەی نەوەکانەوەیە، تۆمارە مێخییـە سـۆمەریەکان نـاوی پادشـاکانی نـەوەی گۆتیـان بـە شـێوەیەکی رێکوپێـك لـە لیسـتێکی تایبەتـدا لـەخۆ گرتبـوو، کـە لایـەنێکی گرنگـی لـە کێشـەی زمـانی گـۆتی ڕووندەکاتـەوە، سـێ نـاو هـەن یەکـەمیان بـە (وارلا، ئیارلا، ئارلا) دەستپێدەکات، بڕگەی یەکـەم لـە نـاوی ناوچـەی (ئـەرمان، ئەیالمان) دەچێت. بڕگەی دووەمـیش لـەو ناوانـەدا (لاکایـە، بـەڵام دواپیتـی یـان دوا دەنگ "ب، (ش) یان (ن)" دەبێت. بەمشـێوەیە هەرسـێ ناوەکـە ئەمانـەن: (ئیارلاگـاب، ئیـارلا، ئیارلاکـان–دا ئـەم ناوانـەش بـە تۆمـارکراوی لـە شـێوەی (وارلاکابـا، ئیارلاکـاش، ئیارلاکـان)یش هـاتووە. دوا نـاویش لـە شـێوازی نـاوی دواپادشـای گۆتییـەکان هـاتووە کەئـەویش (تریکـان)ە، لـە راسـتیدا (ان)ی پاشـگر لـەمجۆرە ناوانـەدا لـە زمـانی دانیشـتوانی دێرینـی چیاکانی زاگـروس و کوردستاندا باوبووە. لە گـەڵ ئەوەشـدا چـەند نـاوێکی گـۆتی دیکـە هـەن وەکـو لاسیراب و شارلاك و هەی دیکەش.

هەروەها لە پاشگرە باوەکانی دیکەی زمانی گۆتی: کە بە هەمان شێوە لە عیلامی و حوریشد بەکاردێت، پاشگری (ش)ە، لە ناوی شوێنەکاندا دەیبینین وەکو سیما-ش، کیما-ش، تورك***-ش و جگە لەمانەش کە هاوشێوەی پاشگری (اش)ی کاشیە، چ لە ناوە ناسراوەکاندا یان لە شوێنەکاندا وەکو: کانداش، کاشتلیاش یان کاردونیاش و توبلیاش، کە هەمان ئەو پاشگرەیە کە لە ناوی هادانیشی پادشای خەمازیدا دەیبینین. بەڕای (دیاگونوف)ی ئەکادیمی ئەم پاشگرە لە هەندێ لە زمانە قەفقازیەکاندا هەیە، بەلاّم لە زمانە سامیەکان یان تورکیەکان و یان هندی-ئۆروپیەکاندا نیە، کە ئاماژە بە دۆخی (Ergative) دەکات (ی.م. دیاکونۆڤ تاریخ الميدبين، مۆسکۆ ١٩٥٦، ص١٠٩)، هەروەها پێی وایە کە زمانی گۆتی زمانێکی سەربەخۆ بووە و ڕێزمانی نەگۆڕی خۆی هەبووە و هەندێ پەیوەندیشی هەبووە لە گەڵ زمانەکانی دیکەی دانیشتوانی چیای زاگرۆسدا.

هەرچۆنێك بێت پاشگرێکی دیکەش هەیە ئەویش (پ-P)ە کە دەکەوێتە کۆتایی هەندێ لە ناوەکانەوە و ئاماژە تافێك دەکات وەك لە لۆبیدا ئاماژە بە دۆخێك دەکات.

گۆتیەکان لای سۆمەریەکان و ئەکەدیەکان وەك ڕەگەزێکی سپی پێست یان زەردکار دەناسران کۆیلەکانیشیان بە (نامرو) دەناسران واتە: (کۆیلەکانی باکوور) لە دوای ئەوەی کەل ە هەزارەی سێیەمی پ.ز ئازادبوونە و ملکەچی هیچ دەسەلاّتێکی بێگانە نەبوونە بازاڕی کڕینیان لە کۆیلەکانی دیکە گەرمتر بووە، ڕایەك هەیە پێی وایە کە ئیاکولابای دامەزرێنەری نەوەی ئاشووری لە سەدەی بیست و سێیەمی پ.ز، ناوێکی گۆتی پێوەبووە.(٤١)

بەلاّم ولاّتەکەیان لە هەزارەی دووەمی پێش زایندا بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی میتانی دواتر پێگەکەی لە هەزارەی یەکەمی پێش زایندا فراوانتر بووە، پادشای ئاشووری شەلمنسەری یەکەم ١٢٨٠–١٢٦١پ.ز لە هەڵمەتەکەیدا بۆ ناوچە شاخاوییەکانی باکووری ئاشوور پێمان ڕادەگەیەنێت کە خوێنی گۆتییەکان لە سنووری ولاّتی ئوراتۆو وەکو ئاو ڕێی دەکرد، تاوەکو کموخی(٤٢)، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان لەم کاتەدا لە ناوچە کوردییەکانی تورکیادا ژیاون هەروەها ناوچەی کەرکووکی ئێستا و توکولتی نینۆرتا ساڵی ١٢٥٠ پ.ز پێمان ڕادەگەینێت گە کۆتی هەن لە سەر ڕووباری زێی بچووك دەژین.

دەربارەی ئەو کارە هونەریانەش کە گوزارشت لە ئاستی ژیاری گۆتیەکان دەکات ئەوا زۆر دەگمەنە، دیاکۆنوف کە پشت بە ڕای دیکە دەبەستێت پێی وایە کە ئەو تابلۆیەی لە کوردستان بە تابلۆی شێخان ناسراوە (هۆرێن، شێخان) لە کاری گۆتیەکانەو ناتەواوە، ئەو نوسینانەی لەسەریەتی ئەوە دەگەیەنن کە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پێش زاین یان لەوە کۆنترە، کەسێك وێنا دەکات بە بێ ناو لە شێوەی (لیشیر– بیرئەنی) و نازناوی پادشای پێ نەدراوە، ئەم ناوەش لە ناوەخۆجێیەکانەو هیچ پەیوەندییەکی بە ئەکەدیەوە نییە لە سەر وتەی دیاکۆنۆف. (دیانۆکۆف، تاریخ المیدین، ص١١٦). هەروەها لاسیرابی پادشای گۆتی گالیسکەیەکی جەنگی کردۆتە دیاری ناردوویەتی بۆ سیبار کە نووسینێکی بیرەوەریانەی لە خۆگرتبوو و تیایدا هاتووە: "چووت خواوەندی گۆتیەکان (عەشتار و زن)ن"

لە لایەکی ترەوە ئەو سەرە برۆنزییەی لە دەوروبەری شاری هەمەدان لە ئێران دۆزرایەوە و ئێستا لە مۆزەخانەی ئەمریکی لە نیۆیۆرك پارێزراوە بە ناوی

(برایمــەر گالیری)"یــەو، ســەری یــەکێك لــە پادشــا گۆتیەکانــە، هەرچــەندە نووسینێکی لەسەر نییە خاوەنەکەی دیاری بکات. هاوشێوەی ئـەم کـارەش لـە سەڵماس لە کوردستـانی ئێـران دۆزراوەتـەوە. سـەرباری هـەموو ئەوانـەش ئـەوا مێژووی گۆتیەکان تاوەکو ئێستاش پێویستی بە توێژینەوەی فـراوانتر هەیـە بـە تایبەت لەو ناوچانەی تیایدا نیشتەجێ بوون چ لـە کوردستـانی عێـراق یـان لـە ئێـران بگـرە تورکیـاش، چـونکە پاشمـاوە شـوێنەواریەکانیان لـە میزۆپۆتامیـا کەمترە لە پاشماوە نووسراویەکانیان، بە زۆریـش ژمارەیـە لـەو مـۆرە لۆلۆییانـە کە بۆتە قاڵبێك بۆ تەنەکان و لە کـاتی نەخشـاندنیان لەسـەر ئـەم مۆرانـە دەری دەخسـتن بـۆ ئـەوەی لــە ســەر شـێوازی هێڵکـاری پوخـت بێـت. هــەروەها بابەتەکانی هەژار ئامێزبوون بە چەشنێك ببـوە نیشـانەیەکی جیاکـەرەوەی ئـەو مۆرانەی دراونەتە پاڵ گۆتیەکان.



**تبلۆی لیشیر – بیر ئەنی لە هۆرێن**



سەرێکی برۆنزی یەکێک لە پاشا گۆتییەکان ( ؟ )
مۆزەخانەی برا یمەر گالیری - نیویۆرك

* **کاشییەکان:**

کاشیەکان بە دراوسێ باشووریەکانی گۆتیەکان و لۆلۆییەکان دادەنرێن، لە ناوچەکانی ناوەڕاستی چیای زاگرۆسدا چەقیان بەستووە، بە زۆریش لە ناوچە لوڕیەکانی ئێستادا (لوردستان) ئەمانە لە مێژوودا ناوبانگیان بە ناوی خواوەندی گەورە یان (کاش)ەوە دەرکردووە، هەروەها لە نووسینە بابلییەکانیشدا بە (کاششو) دەناسران، ئەم ناوە تاوەکو چاخی هللینی بەکارهاتووە و مەقدونیەکان پێیان دەوتن (kossaioi) (٤٢)، ئەوەش لە شێوەی (کوششو- خای) دەچێت کە لە تۆمارەکانی ئەرابخا (کەرکوك)دا بەکارهاتووە و لە سەرەتادا دەشتەکی بوون لە یەکێتیە هۆزگەریەکاندا دەژیان بەڵام لە دوای ئەو گۆرانکاریانەی لە پەیوەندیە ئابوورییەکاندا روویدا، بەشێکیان لە ناوچە رەسەنەکانی خۆیاندا جێگیر بوون. هەروەها ئەو بەڵگانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین باسی زۆر لەو ناوە کاشیانە دەکات کە لە وەرزی دروێنەدا کاریان کردووە یان لەسەر کێڵکەکان لە میزۆپۆتامیا کرێکار بوون، کەچی تاوەکو لە وڵاتەکەیاندا رەگەزە هنیدیە-ئۆروپیەکان دەرکەوتن، چینە دەسەڵاتدارەکەی ئەوێیان پێکدەهێنا و، ئەو چینە ئەرستۆکراتیەیان پێکهێنا کە دەستی گرت بەسەر دەسەڵاتی سیاسی نێوان هۆزەکانیان و، بەرەو وڵاتی بابل پێشڕەوی پێکردن، بەڵام جێنشینەکانی حەمورابی بە تایبەت (سمو- ئیلۆنا) و (ئەبی-ئیشۆخ) توانیان بیانشکێنن بۆیە روویانکردە رووباری دیالەو دیجلە بەرە و ئاراستەکانی باکووری رۆژئاوا و لە ناوچەی فوراتی ناویندا چەقیانبەست و ماوەیەکی زۆر تیایدا مانەوە تاوەکو پادشای حیسی (مورسلی)ی یەکەم هاتە بابلەوە و ئەو خێزانەی لەناوبرد کە لە سەردەمی شازدەیەمی پێش زایین فەرمانڕەوایەتی گرتبووە دەست.

داگیرکردنی بابل له لایەن مورسلی حسیەوە و ئەنجا مردنی سمسۆ –دیتانای دوا پاشای بابلی تەنها خالێکی وەچەرخان بوو بۆ گۆرانکاریەکی گشتگیر لەم وڵاتەدا، و پێشوەخت بۆ ئەم گۆڕانکاریە لە لایەنی مرۆییەوە بۆ چوونە ناوەوە و چەسپاندنی دەسەلات زەمینەی خۆشکردبوو، چ بە رێگەی چەکداری یان ئاشتی، بەم چەشنە کاشیەکان توانیان بەری ئەم داگیرکاریە بچننەوە و دەسکەوتی رامیاری بە دەست بێنن بەهۆی ململانێی نێوان هێزە ڕامیاریەکان لە بابل دا، و سەدەی شازدەیەمی پێش زایین بوو بە سەردەمی توندو تۆڵکردن و چەسپاندنی کۆڵەکەکانی دەسەلاتی سیاسی کاشیەکان لە میزۆپۆتامیادا، بۆیە هیچ هەواڵێکی نووسراومان پێنەگەیشتووە لە سەر داگیرکاری سەربازیی کاشی بۆ وڵاتی بابل، و لە بەر ئەوەی هەواڵی نووسراومان پێنەگەیشتووە لە کاشیەکانەوە لە پێش فەرمانڕەواییان بۆ بابل ئەوا ئەو کێشە مرۆییانە دێنە پێشمان کە پەیوەستن بە بارودۆخی ڕامیاریانەوە لە پێش سەدەی پازدەیەمی پ.ز.

وەك دەردەکەوێت حەوت پادشا یەکەمەکانی نەوەی کاشیەکان لە (کانداش)ەوە کە هاوچەرخی پادشای (سمسۆ–ئیلونا)یە، لە دەروەی بابل لەسەر فوراتی ناوین فەرمانڕەوایەتیان کردووە، و نەوەی کاشی لە بابلەوە دەسپێکی فەرمانڕەوایەتی سەرەتا بەپاشا (ئەگومی دووەم)کە بە ( Agum kakrime) ناسراوە دەستی پێکردووە، هەر ئەویش بوو هەلی قۆستەوە بۆ داگیرکاری حیسی کە فەرمانڕەوایەتی خۆی چەسپاند لە نزیکی ساڵی ١٥٩٠ پ، ز لە گەڵ ئەوەشدا کەموکورتی هەیە لە ناوی ئەو پادشا کاشیانەی فەرمارەوایەتیان لە بابلدا کردووە، لە زنجیرەی کاتی فەرمانڕەوایەتیاندا لە شێوەی دەقی پادشایەتیدا نووسراون، هەروەها ژمارەیەك لە نامە و بەڵگەنامەی ئابووری و بازرگانی و یاسایی هەن کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی کاشی لە بابل دا، لەوانەیە

گرنگترین سەرچاوە ئەم سەردەمەدا ئەو کۆمەڵە نامەیەبن کە لە ئەرشیفی (تل العمارنە) لە میسر دۆزراونەتەوە و دەگەڕێنەوە بۆ پادشا کاشییەکان کە نادروویانە بۆ فیرعەونیەکانی خێزانی هەژدەیەمی شانشینی نویێ لە میسردا.

هەندێجار پادشا یەکەمەکانی کاشیەکان (کانداش و ئەگوم و کاشتلیاش) نازناوی پادشایەتی گۆتی (پادشای چوار ئاراستەکە، پادشا سۆمەر و ئەکەد و پادشای بابل) یان بە خۆیانەوە ناوە، هەرچەندە فەرمانڕەوایەتیەکەیان هێشتا بە تەواوەتی بەرقەرار نەبووبوو، ئەو فەرمانڕەوایەتیەی پادشای دوانزەیەمی کاشی (ئورلام بورباش) هەموو بەشەکانی لە شانشینێکدا جێگیرکرد لەوسەری باشوورەوە تاوەکو سنووری وڵاتی ئاشوور لە باکوور، کە لە مێژوودا بە شانشینی (کاردۆنیاش) ناوبانگی هەبوو.

سەردەمی کاشی لە مێژووی بابلدا درێژترین قۆناغە کە تاڕادەیەك سەقامگیر بووە و تیایدا شانشینی وڵات فەرمانڕەوایی کردووە نەك دەوڵەتی شارەکان، بەڵام کاشیەکان کەمینەیەك بوون لە گەڵ زۆرینەی دانیشتوانی رەسەنی وڵاتدا فەرمانڕەواییان دەکرد، کە شارستانیەتیەکەی بەسەریاندا زاڵبوو و ئاوێتەی بوون و تیایدا توانەوە، ئەنجا زمانی وڵاتیان و کەلتوورە گشتییەکەیان وەگرت و شتێکی ئەوتۆیان بۆ بەجێنەهێشتین کە بە زمانی خۆیان نوسرابێت جگە لە ناوی چەند پادشایەك و ژمارەیەك خواوەند نەبێت هەروەها چەند زاراوەیەکی کاشی کەم کە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی بابلی. دیارترین شت کە گوزارشت بکات لە ئاوێتەبوونی کاشییەکان لە گەڵ شارستانیەتی میزۆپۆتامیادا ئەوەیە کە یەکەم پادشایان کە لەبابل فەرمانڕەوایی کردووە (ئەگۆم کاکریمیە ١٦٢٠-١٥٨٥ پ.ن) هەڵمەتێکی تایبەتی کردووە بۆ گەڕاندنەوەی پەیکەری خواوەند هەردۆخ و پەیکەری (سەربەنیتم) لە ناوچەی عانە و بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورەی

سازکردووە، ئەنجا هەستاوە بە دووبارە دروستکردنەوەی پەرستگای ئەم خواوەندە لە بابل و دەقێکی دور و گرنگی بۆ بەجێهێشتووین لەسەر ئەم رووداوە: هەروەها پادشا (کارایندداش) کە لە ناوەراستی سەدەی پانزەیەمی پێش زاین ژیاوە پەرستگەیەکی دروستکردووە و پێشکەشەی کردووە بە ژنە خواوەند (ئینانە) کە کنەو پشکنینە شوێنەوارییەکان لە ئوروك (وەرکا) دەریان خستووە(٤٦). سەرەڕای ئەوەی کە ئەم پەرستگایە ئەو بینا گەورە و زەبەلاحە نییە، بەڵام بە بنچینەکانی و بەرزی دیوارەکانی چەند تایبەتمەندییەکمان پیشان دەدات کە جیای بکاتەوە لە کۆنترین هونەری بیناسازی لە وڵاتی بابلدا.

نەخشەی گشتی بیناکە پێکهاتووە لە ژووریکی درێژ کولآنە لە گەڵ هۆڵێك لە پێشەوە، یەکەمیان لە تەنیشتەوە هۆڵی بچووك دەوری داوە، سەرباری ئەوەش پەرستگاکە رووی پێشەوەی بەرز و لە خشتێك دروستکراوە کە بە شێوەیەکی یەك لە دوای یەك ڕیزی بەستووە و دیمەنی خواوەندی شاخ و ئاو دەگەینێت. ئەم پەرستگایە هەرەچەندە سادەبێت، ئەوا وەکو بەڵگەیەکی زیندووی لە سەر شارستانیەتی تایبەتی کاشی دەمێنێتەوە هەروەها لەسەر پەیوەندییەکانی لە گەڵ شارستانیەتی گەلە شاخاوییەکاندا، ڕازاندنەوەی سەر دیوارەکانی هاوشێوەی نەخشی دیوارەکانی سەر دەرگای عەشتاری لە شاری بابلە لە دوا سەردەمەکان و بە گشتی زۆربەی پادشا کاشیەکان خۆیان سەرقاڵ کردووە بە پرۆژەی ئاوەدانکردنەوەی شارە جیاواز و گرنگەکانی بابل لە پێش هەموویانەوە نۆژەنکردنەوەی پەرستگاکان لە شارەکانی (نەفەر) و (ئو) و (لارسا) و (وەرکا) بە هونەرێکی بیناسازی دەگمەن کە دواتر بۆ ئەخمینییەکان مایەوە و لە بینای بەرسیبۆلیس ی پایتەختیاندا بە کاریان هێنا.

له ناوەراستی چاخی کاشیدا پادشا کاشییەکان شارێکی نوێی زەبەلاحیان بنیادنا لە دووری بیست میل لە ڕۆژئاوای مەڵبەندی شاری بەغداوە کە پاشماوەکەی بە (عەگەرگۆف) ناسراوە، ناوی (دور-کۆریکالزۆ)یان لێناوە، کە لە پاڵ بابلدا بوو بە پایتەختی دووەمی شانشینی کاشی، دامەزرێنەری یەکەمی ئەمشارەش پادشا (کۆریکالزۆی یەکەم)ی پێشینی پادشا کاریناشە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا، بەڵام نۆژەنکەر و تەواوکەری بینای ئەم شارە، پادشایەکی دیکە بووناوی بنیادنەری یەکەم بوو لە گەڵ یەکێك لە جێنشینانی بە ناوی (کۆریکالزۆی سێیەم)، بوو لێرەدا سروشتی بیناسازی کۆنی بابلی لە هونەری بیناسازیدا لە سیماکانی ئەم شارەدا دەردەکەون، کەچی هەندێ تایبەتمەندی هونەری هەن کە تایبەتن بە کاشییەکانەوە بۆ نموونە وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی لە سەر دیوارەکان، هونەری گەلانی چیاکانی زاگرۆس و کوردستان دەخاتەوەبیر.

رای راست ئەوەیە کە (کۆریکالزۆری دووەم) قولە (زەقورە)ی شارەکەی دروستکردبێت و پەرەستگا و تەلارەکانی فراوان کردبێت. ئەمەش لە بیناو ئاوەدانکردنەوەی شارەکانی تردا چالاکبوو ئەم قولەیەش ئەڵقەیەکی گرنگ بوو لە پێشکەوتنی زەقورەکاندا لە نێوان سەرەتای دەرکەوتنیدا لە سەردەمی نەوەی ئوری سێیەمدا کە لە سێ چین پێکاتبوو وەکو قولەی ئور و قولەی وەرکا و لە نێوان قۆناغی کۆتایی کە سەردەمە دواییەکان تیایدا پەرەی سەندووە، بە تایبەت لە سەردەمی بابلی نوێدا (سەدەی شەشەمی پێش زایین) کە بە زۆری تیایدا بوو بە حەوت چین، لەو بارەیەشەوە بەشەکانی ئەو تەلارانەی پشکنینی تیایدا کراوە، لایەنی گرنگی لە هونەری بیناسازیدا دەرخستووە و لە پێش هەموو شەوە زەبەلاحی دیوارەکان، لە عەگەر گۆف سێ مەتر بوو، بە خشتی قەبارە گەروە دروستکرابوو، لە هەندێك بەشەکانی ئەم تەلارانە نمونەی نەقش و دیواری بۆیاخ

کرا و دۆزراوەتەوە، کە هەندێکیان لە شێوەی مرۆڤ نەخشرێنراون و گرنگیەکی تایبەتی هەیە لە لایەنی پۆشاک و جلوبەرگەوە. هەروەها پەرستگاکان بە فراوانی و گەورەیی دیوارەکانی دەردەکەون، و تایبەت کراون بە پەرەستنی خواوەند (ئەنلیل) و ژنەکەی (نەنلیل) و (نەنورتا)ی کوڕیان لەسەر دیواری ڕێڕەوی سەرەکی ئەم پەرستگایانە خشت هەیە بە ناوی پادشا (کۆریکالزۆ)وە مۆرکراوە، هەروەها تۆمارکردنی دامەزراندنی پەرستگا بۆ ئەو خواوەندانە لە گەڵ ناوەکانیان و ناوی پەرستگاکانیشیان لەم ناوچەیەدا پەلاشەی زۆر لە پەیکەرێکی گەورەی خودی پاشا کۆریکا لزۆ دۆزراوەتەوە، کە بە نووسینی مێخی نەخشێنراوە کە بە پێ نەخێشنراوە و بە زمانی نوسراوە.

لە ڕاستیدا کاشیەکان سەرباری ئەو خواوەندە خۆماڵییەی کە لە وڵاتی ڕاستەقینەی خۆیاندا پەرستوویانە، ئەوا باوەڕیان بە هەندێ لە خواوەندەکانی گەلە هیندو -ئۆرۆپییەکانیش هێناوە، لەوکاتەی لەوێ بەشێکیان چینی ئەرستۆکراتیان پێکهێنا، ئنجا لە کۆڕی خواوەندیی کاشیدا ناوی ئەم خواوەندانە دەرکەوت سووریاش (خواوەندی هەتاو) هاوشانی خواوەندنی هیندی سوریاو و ئاهورای ئێرانی، ئنجا خواوەند (ماروتاش) ئەویش ماروتی هندیەو هەروەها خواوەند (بوریاش) خواوەندی گەردەلوول کە دەکاتە بوروباسی یۆنانی، سەرباری ئەوەی باوەڕیان بە خواوەندەکانی میزۆپۆتامیا بووە، ئەوا بەردەوام بوون لە پەرستی ئەو پەرستراوانە لە پاڵ خواوەند کاش و خواوەند شیباك و خڕبی و هیتریش لە خواوەندە خۆماڵییە کاشییەکان.

پێ دەچێ لە دیارترین دیاردەکانی لایەنی شارستانی لەسەردەمی کاشیدا ئەو هێمایانە بێت کە لە بەرد دروستکرابوون بۆ دیاریکردنی ئەو زەوی و زارە کشتوکاڵییانەی پێیان دەوت (کودورۆ) لە شاری (سوزا)ی پایتەخی عیلام

ژمارەیەکی زۆری لێدۆزراوەتەوە، کە لە وڵاتی بابلەوە گوازراوەتەوە وەکو دەسکەوتی ئەو شەڕەی کە یەکێك لە پادشا عیلامییەکان دواتر بۆ سەر میزۆپۆتامیا هەڵیگیرساند ئەم پارچانە بەوە جیاوازن کە شێوەیەکی درێژکۆلآنەی قۆچەکیان هەیە، کە زۆرجار لە نەخشاندنی ئەملاولای ناکارامەیی پێوە دیارە، لە بنچینەشدا ئەم بەردانە بە تایبەتی بۆ ئەوە دروستکراون کە ببنە هێمایەکی جیاکەرەوە لە نێوان ئەو کێڵگە کشتوکاڵییانەی کە پادشا دابڕیکرد بۆ گەورە فەرمانبەران یان زەیوانەکان یان تەرخانیکرد بۆ پەرستگاکان، سەرباری ئەوەش زۆرجار ئەم بەردانە پەیوەست بوون بە چەند تازیاریەکی تایبەتەوە بۆ نموونە وەك لادانی باج و سەرانە لەسەر ئەو زەوییانەی

دیاریانکردووە، ئەم بەردانە بە بێ جیاکردنەوە دەقی دابڕینی ئەو زەویەکەی تێدایە لە تەنیشتییەوە نەخشێك هەیە ڕێزێکی درێژ ئەنوێنێ لە سیمبول و نیشانەی خواوەند وەك گەواهییەك بۆ دروستی دەقی بەڵگەنامەکە.

## * خوریەکان و میتانیەکان

### أ- خوریەکان

ئەو بەڵگانەی لە بەردەستدان ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە لانکەی ڕەسەنی خوریەکان دەکەوێتە ناوچەکانی باکووری دۆڵی دوو ڕووبارەوە، کە درێژ دەبێتەوە لە نێوان شاخەکانی تۆرۆس لە نزیك کەرکەمیش و تاوەکو دەریاچەی وان(٤٩). و هەر لە نیوەی هەزارەی سێیەمی پێش زاینەوە لە مێژوودا دەرکەوتوون. و بەهۆی هێزی ئەو دەوڵەتۆکانەی ئەو کات فەرمانڕەوای عێراقیان دەکرد خورییەکان لە سەرەتادا ملکەچی دەسەلاتی سۆمەری بوون دواتریش دەسەلاتی ئەکەدی. هەر لە بەر ئەم هۆکارە خورییەکان بوونە ئەو

ئامرازەی کە سیمای شارستانیەتی ولاتی دۆڵی دوو رووباری گواستەوە بۆ ئاسیای بچووك و ولاتی شام.

لەو پادشا خورییە یەکەمانەی کە دەقە مێخییەکانی دوایی فەرمانڕەواییان لە شاری ختوشای پایتەختی دەوڵەتی حسیەوە باسیان لێوە دەکات (کیکلپ- ئەتەل KIKLIP-ATAL)ە کە بارەگای فەرمانڕەوای لەشاری (تووکریش TUKRISH) بوو کە شوێنەکە بە دڵنیاییەوە دیارینەکراوە، بەلام بە دڵنیاییەوە بە دوورییەکی زۆر دەکەوێتە رۆژهەلاتی دجلەوە واتە لە ناوچەی لوڕستان، ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەم پادشایە یان دەکەوێتە کۆتاییەکانی فەرمانڕەوای ئیپراتۆریەتیی ئەکەدییەوە یان کاتی زاڵبوونی گۆتییەکان بە سەر عێراقدا(٥٠). ئەو ماوەیەی کە خوریەکان توانیان تیایدا دەوڵەتە فراوانەکەیان دامەزرێنن، دوای رووخانی ئیپراتۆریەتی ئەکەدی و نەمانی دەسەلاتی گۆتی بوو لە عێراقدا. ئەوپادشایەش کەڕابەری ئەم دەوڵەتە فراوانە بوو ناوی (ئەتیل شین) بوو، هەندێجاریش لە شێوەی (ئەری شین ARI-SHEN) هاتووە ئەم پادشایە تابلۆیەکی برۆنزی بۆ بەجێهشتووین لە بنەرەتی پەرستگای نرکالدا دۆزراوەتەوە بە نووسینی مێخی و زمانی ئەکەدی نووسراوە تیایدا هاتووە کە (ئەتیل شین) کوڕی (شەتەرماتSHATAR-MAT) پادشای (ئورکیش URKESH) و (نەوار NAWAR)ە، (٥١) ئەگەر زانیمان شاری (نەوار) دەکەوێتە رۆژهەلاتی رووباری دیجلەوە و لە نێوان زێی خواروو رووباری دیالەوە. و شاری (ئۆرکیش)یش دەکەوێتە لای سەرچاوەکانی رووباری خاپوور واتە: لە سنووری تورکیا سوریا(٥٢). ئەوا بە روونی بۆمان دەردەکەوێت کە نەمانی دەسەلاتی ئەکەدی و گۆتی وایکرد کە (ئەتیل شین) بتوانێت ئەم دەوڵەتە فراوانە پێکەوە بنێت، هەروەها لە بەر ئەوەی شاری (ئۆرکیش)

مەڵبەنـدی پەرسـتنی خواوەنـدی خـوری (کومـارب KUMARB)ە ئـەبێ پایەختی دەوڵەتەکە بووبێت.

لە کاتی دەرکەوتنی نەوەی سێیەمی ئـوردا ۲۱۱۱-۲۰۰۳پ.ز و هەوڵدانی بۆ سەپاندن دەسەڵاتی بە سەر وڵاتدا کاریگەری خوریـەکانی کـەمکردەوە، چـونکە پادشای سۆمەری شولکی ۲۰۹۳-۲۰٤٦پ.ز چەندین شـەڕی لـە گـەڵ خوریـەکان بەرپا کرد و لە گەڵ خۆشیدا دیلێکـی زۆری هێنـا، بـە چەشـنێك ناوەکانیـان لـە دەقە مێخییـەکان دەهـات و لـە دیـارترین ئـەم ناوانـە (ئونـاب شـین UNAP-SHEM)ە کە ناوێکی سـۆمەری بـە کوڕەکەیـەوە نـاوە، ئەمـەش لـە راسـتیدا هێمایەکـە بـۆ توانـەوەیان لـە نـاو کۆمـەڵگای نوێـدا، هـەروەها لـە خـودی تێکستەکانی نەوەی سێیەمی ئوردا دەردەکەوێت کـە شـاری (ئـۆرکیش) لەسـەر سەرچاوەکانی رووباری خاپووردا دوور لە دەسەڵاتی نەوەی نـاوبراو ماوەتـەوە، چـونکە لـە نـاو هەواڵـەکانی هەڵمەتـە سـەربازییەکاندا باسـنەکراوە۵۳)، و لـە کاتێکدا ئەو شەپۆلە ئەمورییانەی کە لە ڕۆژهـەڵاتی عێراقـەوە هـاتبوون فشـاری دەخستەسـەر نـەوەی سێیەمی ئـور لـە کۆتاییـەکانی هـەزارەی سـێیەمی پـێش زایندا، ئەوە خوریەکانی لە دەسەڵاتی نەوەی ناوبراو رزگار کرد بە چەشنێك کـە توانییـان دووبـارە زۆربـەی بەشـەکانی بـاکوور و بـاکووری رۆژهـەڵاتی عێـراق کۆنترۆڵ بکەن، کە یەکێك لە پادشاکانیان بـە نـاوی (تـیش ئـەتیل)ەوە نازنـاوی (پیاوی نەینەوای) لە خۆی ناوە، چونکە دەقەکانی شانشـینی ئیشـنووناى سـەر رووبـاری دیـالا ئـەوەی سـەلماند کـە زاڵبـووە بـە سـەر بەشـەکانی سـەرەوەی ناوچـەی ئاشـوور و بـە تایبـەت ئـەو شـارەی کـە خواوەنـدی خـوری (شاوشـکا SHAWUSHKA)ی تیا پەرستراوە کە لە پلەو پایـەدا هاوشـانی خواوەنـد عەشتارە(٥٤).

ئەم (تیش ئەتیل)ەش بە هەمانشێوە نووسینێکی مێخی بۆ بەجێهێشتوین کە تایبەتە بە پەرستگای خواوەند نرکال بەلآم بە زمانی خوری نووسراوەتەوە ئەم نووسیینەش بە کۆنترین نموونەی زمانی خوری دادەنرێت و وەرگێڕانەکەی بەمجۆرەیە (تیش ئەتیل، ئینـدان - (فـەرمانڕەوا) ئۆرکیش، پەرستگایەکی بۆ خواوەنـد نرکال دروست کـرد، و بریا ئـەم پەرستگایەش لـە لایـەن خواوەنـد (لوباگادا LUBAGADA)ەو بپارێزرێت، هەرکـەس ئـەیڕوخێنێ (واتـە ئـەم پەرستگایە ئەڕوخێنێ) خواوەند (لوباگادا) لە نـاوی ببـا، خواوەنـدی کەشـوهەوا نزای قەبووڵ نەکا و خانمی نکار و خواوەندی خـۆر و خواوەنـدی کەشـوهەوا.... بۆ ئەو کەسەی دەیڕوخێنێ) (٥٥).

لەو راستیانەی کەشایەنی باسکردنە لەم بوارەدا ئەوەیە کە دەقە مێخیـەکان باسی ناوی زۆر لەو پادشا ئەکەدی و سومەریانە دەکات کـە خۆیـان کـردووە بـە خواوەند، بە چەشنێك لە بەردەم ناوەکانیاندا هێمای سـەلماندنی خواوەنـدێتیان داناوە، لە رێگەی یەکێك لەو مۆرە لولەکییە خوریەکانـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کە بە هەمانشێوە (تیش ئەتیل) لە بەردەم ناوەکەی خۆیدا لەو هێمایەی دانـاوە و خۆی بە پادشای (KARAHAR) وەسفکردووە. هەندێ پادشای دیکـەش خۆیـان کـردووە بـە خواوەنـد وەك (ئیدیسـوین IDI-SUEN) لەشـاری سـیمرومەوە و کوڕەکـەی زبازونـە و بـە هەمانشـێوە (زاردەمـو- ZARDAMU)ی پادشـای شـاری (کاداخـار) شـاری (کاداخـار)یش هەمانشـاری (خـار-خـار)ە کـە باسـی هـاتووە لـەو نووسـینە ئاشـوورییانەی دەکەونە بەرزاییەکانی رووباری دیالەوە(٥٦)، سەرباری ئەوەی باسکرا رووخـانی نەوی سێیەمی ئور بوو بە هۆی سـەربەخۆیی زۆر لـە فـەرمانڕەوا ناوخۆییـەکانی ناوچـە چیاکانی زگروسـدا، بـەلآم نـەبووە یارمەتیـدەرێك بـۆ دامەزرانـدنی یـەك

دەوڵەتی یەکگرتوو، چونکە ئەو نەوانەی لە دوای نەوەی سێیەمی ئوورەوە لە دەشتی نیشتوودا فەرمانڕەواییان کردووە بواری نەداوە بە خوریەکان کە دەست بخەنە ناو دەستی ناوبراوەوە. لە گەڵ ئەوەشدا رووخانی نەوەی ماری (ناوەتازەکەی گردی حەریر، لە سەر سنوری عێراق سوریا) یارمەتی خوریەکانی داوە بۆ پێکهێنانی چەند دەوڵەتۆکەیەکی بچووک، وەك لە خوارەوە ناوی ئەم دەوڵەتەتۆکانەو ناوی ئەو پادشایانە دێت کە فەرمانڕەوایەتیان تیا کردووە:

١- ئەتیل شین، پادشای بوروندۆم (نزیك غازی عەنتاب).

٢- شوکروم تیشۆب، پادشای ئیلاخوت (لە نێوان کرکەمیش و دەریای ناوەڕاست).

٣- نانب شاویری، پادشای خابوراتوم (نزیك گردی عەجاجە لە سەر رووباری دیجلە).

٤- شادو شری، پادشای ئەزوخینوم (نزیك نوزیٚ).

٥- تیش ئولمیە، پادشای ماردنام (ماردینی ئێستا).

٦- شین نام، پادشای ئورشوم (لە سەر رووباری فورات نزیك ئۆرفە).

٧-ئەنیش حۆربی، پادشای خاشوم (نزیك کرکەمیش).(٥٧)

سەرباری ئەوەی باسکرا لە چارەکی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زایندا خوریەکان توانیان بە چەند شوێنێکی (هلال الخصیب)دا بڵاوببنەوە تا گەیشتنە شاری ئالاخ= (تل العطشانة) کە دەکەوێتە نێوان حەلەب و ئەنتاکیەوە، هەروەها لازقیە و نوزیٚ لە نزیك کەرکووك، شوێنەوارەکانیشیان لە هەندیٚ شوێنی تردا دۆزراونەتەوە وەکو تەپەگەورا و تەل ببلا لە نزیك مووسڵ.(٥٨)

پێش ئەوەی کۆتایی بە باسەکەمان بهێنین لە بارەی خۆریەکانەوە پێویستە باس لەوە بکەین کە زمانەکەیان پەیوەندی هەبووە بەو زمانەی لە ناوچەی

سۆبارتۆ بلاوبووه، واته زمانی سوئیبیەکان، کە پیشتر لێکچوونیمان لە گەڵ زمانی لۆلۆبیەکاندا روونکردەوە.

بەو پێیە ئەتوانین بڵێین زمانی گەلانی ئەم ناوچەیە تارادەیەکی زۆر لە یەکچوندا نزیکن، چونکە هەموویان لە یەك ڕەگەزن، لە نموونەی زمانی نەتەوەکانی دوورگەی عەرەبی، لەبەرئەوەی لە یەك ڕەگەزن، لە کۆتایی بابەتەکەشدا پێویستە باس لەوە بکەین کە رۆڵی خوریەکان وەك هێزێکی فەرمانڕەوا لەو ناوچانەی تێیدا بوون کۆتایی نەهات تا کۆتاییەکانی سەدەی شازدەیەمی پێش زایین، کە دەقە مێخییەکان وردە وردە بەڵگە دەکەن لە سەر گواستنەوەی دەسەلآت لە دەستی ئەوانەوە بۆ دەستی میتانیەکان دەدەن. وەك لە خوارەوە خشتەیەك هاتووە بەناوی ئەو پاشا خوریانەی کە توانراوە ماوەی فەرمانڕەواییان دیاری بکرێت لە گەڵ ئەوانەی هاوچەرخیان بوون لە قۆناغە مێژووییەکاندا و پادشاکانی ولآتی دوو رووبار.

**خشتەیەکی تایبەت بە ناوی پادشا خوریەکان و دەوڵەتەکانیان و ئەوانەی لە ولاّتی دوو رووباردا هاوچەرخیان بوون**

| ناوی پادشا خوریەکان | هاوچەرخەکانیان لە ولاّتی دوو رووباردا |
| --- | --- |
| | قۆناغی ئەکەدی ٢٣٤٠-٢١٩٨پ.ز |
| | سەرگۆنی ئەکەدی ٢٣٤٠-٢٢٨٤پ.ز |
| | ریمۆش ٢١٨٤-٢٢٧٥پ.ز |
| | مانشتوسو ٢٢٧٥-٢٢٦-پ.ز |
| | ئەرام سین ٢٢٦٠-٢٢٢٣پ.ز |
| | شارکلی شری ٢٢٢٣-٢١٩٨پ.ز |
| کیکلب-ئەتیل، پادشای تورکیش | قۆناغی گۆتی، نزیکەی ٢٢٣٠-٢١١٦پ.ز |
| | پادشای یەکەم: ئەریدۆ بیزەر |
| | دوا پادشا: تیرقات |
| شترمان: باوکی ئەتیل شین ئەتیل شین، | نەوەی سێیەمی ئوور: ٢١١١-٢٠٠٣پ.ز |
| پادشای ئورکیش و ئەوار. | ئور نمو ٢١١١-٢٠٩٤پ.ز |
| | شولکی ٢٠٩٣-٢٠٤٦پ.ز |
| | ئەمارسین ٢٠٤٥-٢٠٣٧پ.ز |
| تیش ئەتیل، پادشای نەینەوا، | شوسین ٢٠٣٦-٢٠٢٨پ.ز |
| تیش ئەتیل، پادشای کەراخار | ئەبی سین ٢٠٢٧-٢٠٠٣پ.ز |
| | سەردەمی کۆنی بابلی |
| | پادشا حامورابی لە نەوەی یەکەمی بابل |
| ئەتیل شین، پادشای بوروندوم | ١٧٩٢-١٧٥٠پ.ز |
| شوکروم تیشوب، پادشای ئیلاخون | |
| | شمشی ئەدرەر ئەشمی دکان لە پاشاکان |
| نانب شاویری، پادشای خاپوراتوم | ولاّتی ئاشوور |
| شادوشری، پادشای ئەزوخینوم | زمیر لیم، پادشای نەوەی ماری. |
| تیش ئولمیە، پادشای ماردنام | سمسو دیتانا ١٦٢٥-١٥٩٤پ.ز لە پادشاکانی |
| شین نام، پادشای ئورشوم | نەوەی یەکەمی بابل. |
| ئەنیش خوربی، پادشای خاشوم. | |

## ب- میتانیەکان

لە دەقە نوسراوەکاندا و لەو ماوەیەی پێش سەدەی پازدەیەمی بیش زاینی کەوتووە هیچ باسێکی میتانییەکانمان دەستنەکەوت، بەڵام لە گەڵ کۆتایی سەدەی ناوبراوە هەندێك لە پادشا خوریەکان نازناوی میتانییەکانیان لە خۆیان ناوە بە تایبەتیش ئەوانەی لە دۆڵی هەردوو رووباری خاپوور و باڵیخ جێگیربوون(٥٩).

هەربۆیە پێما وایە کە میتانییەکان شەپۆلێکی نوێ بوون لە سەرەتادا لە دەروبەری هەردوو رووبار ناوبراودا جێگیربوونە، ئەو دەوڵەتەش کە بنیادیان نا لە لایەن ئاشوورینەکانەوە ناونرا (خانی کلباد) و لە لایەن حسیەکان و میسرییەکانەوە ناونرا (نەهارین) یان (نەهارینا).

لە دەوروبەری ١٤٧٠ پ.ز، میتانیەکان توانیان خاکی شانیشینەکەیان فراوانبکەن وشاری حەلەبیان کۆنترۆڵکرد تاوەکو فەڵەستین گەیشتن، چونکە میتانییەکان کاری بەخێوکرنی ئەسپ و دروستکردنی گالیسکەی سەربازی دووچەرخیان دەکرد. ئەمەش یارمەتیدان بۆ بڵاوبوونەوەیەکی خێرا لە ناوچەکەدا بە چەشنێك رووبەری نێوان کەنارەکانی دەریاری سپی و ناوراست و شاری ئوزێی نزیك کەرکوکیان گرتە دەست.(٦٠)

لە راستیدا گرنگیدانی پادشا میتانیەکان بە بەخێوکردنی ئەسپ و پیشەسازی گالیسکەی سەبازی لەوەوە نەهاتووە کە ئەوان لە ئەسپ و گالیسکەی سەربازی توانیان زۆرتر بووە یان تێگەیشتوتربوون لە پادشا خوریەکان و ئەوانەی تر، بەڵکو ئەوەی یارمەتیدان ئەوەیە کە هاتنیان بۆ فەرمانڕەوایی هاوکات بوو لە گەڵ دەرهێنانی ئاسن دا، کە یارمەتیدەرێك بوو بۆ دروستکردنی ئەو گالیسکانەی ئەتوانێت بەرگری خێرایی ئەسپیش بگرێت و

سەرباری بوونی ئەسپ لە ناوچەکەیاندا. بۆیە پێویستیی بۆ ئەسپ دەرکەوت و میتانییەکان و غەیری ئەوانیش گرنگیان پێدا.

ئەو گلیسکانەش کە پێش دەرکەوتنی ئاسن دروستکرابوون بەرگەی خێرایی ئەسپی نەدەگرت، بۆیە ئەسپ لە پێش بلاوبوونەوەی کانزابی ئاسنەوە ئاژەڵێکی کەمسوود بوو، هەر بۆیە نەخوریەکان پێی نەدا کە پێش سەدەی پازدەیەمی پێش زایین ژیاون گرنگیان پێدا و نە ئەوانەی هاوچەرخیان بوون یان پێش ئەوانیش هاتوون.

یەکەم پادشای میتانی وەك لە دەقە نوسوراوەکاندا دەردەکەوێت (پەرا تەرنا- PARRATARNA)یە و ماوەی فەرمانڕەوایەتی لە سەرەتاکانی سەدەی پازدەیەمی پێش زایندایە و ئەگەری گەورە هەیە ئەم پادشایە بوو بێت کە شاری حەلەبی کۆنترۆڵ کردبێت.

لە دەوروبەری ١٤٦٠پ.ز پادشا (کیرتا Kirta) هاتە سەرتەختی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی میتانی دوای ئەو ئەم سێ پادشایە هاتن:

١- شوتەرنا SHUTTARNA، کوڕی کیرتا.

٢- پارساتاتار PARSATATAR، لە دەوروبەری ١٤٤٠ پ.ز

٣- ساوشتاتاری یەکەم SAUSHTATAR، کوڕی پارسا تاتار.

زانیاریەکان تایبەت بە زنجیرەی ئەم پادشایانە لە یەکێك لەو ناوچانەدا دەستمان کەوتووە کە لە نوزیّ ی نزیك کەرکووك دۆزراونەتەوە.

هەروەها ئەو زانیارییانەی کە لە بەردەستماندایە دووپات دەکەنەوە کە پادشا ساوشتتری یەکەم توانیویەتی پلەوپایەی دەوڵەتی میتانی بگەڕێنێتەوە دوای ئەوەی کە فیرعەونی میسری (تەحۆتمس)ی سێیەم هەرەشەی لێکرد، کاتێك کە رێبەرایەتی هەڵمەتێکی سەرکەوتووی کرد بۆ سەر (قادش) ساڵی

١٤٤٧پ.ز، واته پێش ئەوەی شاوستتری یەکەم و دەسەلأت بگرێتە دەست و لە گەڵ سوپاکەیدا گەیشتە رووباری فورات بۆ ئەوەی دڵنیابێت لە سنووری دەوڵەتەکەی هەستا بە گرێدانی هاوپەیمانیەك لە گەڵ میسردا، لە رێگەیەوە هاوکاری ئەوانی بە دەستهێنا بۆ داگیرکردنی شاری ئاشوور، بەم داگیرکردنەش ئەم پادشایە هەموو ئەو ناوچانەی سەربە خوریەکان بوون خستیە ژێر دەسەلأتی خۆیەوە، و وەشوکانی = (رأس العین) لای سەرچاوەکانی رووباری خاپوور، کردە مەڵبەندی فەرمانڕەوایەتییەکەی.(٦١)

له دوای ساوشتتر لە فەرمانڕەوا کردنی دەوڵەتی میتانیدا پادشا پەراتەرنای دووەم (PARRATTARNA) هاتووە، لە سەردەمی ئەودا ململانێ لە گەڵ میسردا زیادی کردووە لە پێناو کۆنترۆڵکردنی وڵاتی سوریا، زانیارییەکانی بەردەست جەخت دەکەنەوە کە ئەم ململانێیەی نێوان هەردوو دەوڵەت درێژەی کێشاوە، بەلأم ناوبەناو تاوەکو سەردەمی فیرعەون تەحۆتمسی چوارەم ١٤٠٠-١٣٩٠ پ.ز کە فیرعەونی ناوبراو هەڵمەتێکی ئامادە کردووە دژ بە (نەهارین) واتە دژ بە دەوڵەتی میتانی.

له گەڵ ئەم راستیەی کە تایبەتە بە ململانێکەوە، لە سەردەمی فیرعەون ئەمینۆفسی دووەمدا ژ٤٢٨-١٤٠٠ پ.ز کە لە فەرمانڕەوایدا پێش تەحۆتمسی چوارەم کەوتووە، یەکەم هەوڵیدا بۆ بەستنەوەی پەیوەندییە دیبلۆماتییەکان لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا، و پەیمانێکی ئاشتی بەردەوامی لێکەوتەوە لەنێوان هەردوو دەوڵەتەدا، و هەر لە بەر کاریگەری ئەم بەیاننامەیە پادشای میتانی (ئەرتاتاما) یەکەم کە یەکێکە لە نەوەی پادشا ساوشتر، کچەکەی خۆی وەك هاوسەرێك ناردووە بۆ فیرعەنی میسری، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی میتانی لە گەڵ میسردا هاوشان بووە.

پــاش ئــەرتاتامای یەکــەمیش شــوتەرنای دووەم هاتــە ســەرتەختی فــەرمانڕەوایی دەوڵــەتی میتــانی کــە بــە هــەمان شــێوە شــازادە (کیلـۆ خیپـا KELUHEAP) کچـی وەك هاوسـەرێك نـاردووە بـۆ فیرعـەون ئەمینۆفسـی سـێیەم ۱۳۹۰–۱۳۵۲پ.ز و سـەریاری ئەمـەش پادشـا شـوتەرنای دووەم کـە دەبیسـتێ فیرعـەون نەخۆشـە پەیکـەری خواوەنـد شاوشـکا (عشـتاری شـاری نەینەوا)ی ناردووە بۆ میسر بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێك بۆ چاکبوونەوەی.(٦٢)

لـە دوای مردنـی پادشـا شـوتەرنای دووەم، ململانێیـەك لەسـەر دەسـەڵات روویـدا بـوو بـە هۆکـاری هەژانـدنی دەوڵـەت، بـەو هۆیەشـەوە (ئەرتاشـومارا ARTASHUAMRA)ی جێنشینی شـەرعی دەسـەڵات لـە سـەر دەسـتی شۆڕشگێڕێك تیرۆر کرا کە ناوی (ئۆتخی) بـوو و لـە بنـەماڵی فـەرمانڕەوا نـەبوو، ئـەم شوڕشـگێڕە یـەکێك لـە کوڕەکـانی شـوتەرنای دووەمـی بـە شـێوەیەکی ڕووکەش وەك پادشا دامەزراند بۆ ئەوەی بتوانێت ئامانجەکانی بە دەستبێنێت.

لـە میانـەی ئـەم رەوشـە نائاسـاییەدا ئـەو پەیوەندییـە باشـەی لـە نێـوان دەوڵەتی میتانی و میسریدا هەبوو پچڕا، بـەڵام کاتێك توسـرانا تـوانی خـۆی لـە ژێر ڕکێفی (ئۆتخی) ئازاد بکا چوو بە گژی ئەرتاشومارای برایدا و کاری کـرد بـۆ بــەهێزکردنی ئــەو پەیوەندییــە بــە مــارە کردنــی شــازادە (تاتوخیبــا TATU.HEPA)ی کچـی لـە فیرعـەونی میسـر ئەمینۆفسـی سـێیەم.ئەنجا پەیوەندی نێوانیان گەڕایەوە دۆخی جاران.(٦٣)

(تۆتخی)یش بەچەشنێك وون بـوو، کـە هـیچ شـوێنەوارێکی لـە وڵاتـدا نـەما، بـەڵام دوای چـەند سـاڵێك لـە ژێـر نـاوی (ئـەرتاتاما ARTATAMA)دا دەرکـەوت و نازنـاوی پادشـای خوریـەکانی لـە خـۆی نـا، لـە گـەڵ حسـیەکاندا هاوپەیمانی لە دژی میتانیەکان بەسـت، لـە راسـتیدا بـە تـەواوەتی نـازانین ئـەم

ئەرتاتامايە بە راستی فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیەی کردووە کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی میتانییەوە، یان تەنها حیسیەکان میتانییەکانیان پێ تۆقاندووە؟.

ئەمەو نامەکانی تەل ئەلعمرنە = (پایتەختی میسری طیبة) فیرعەونیەکانی میسر و لە نێوان کاشییەکان و میتانییەکان و حیسیەکاندا ئالۆگۆڕی پێکراوە، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زمانی نامەگۆڕکێی دیبلۆماتی ئەوکات زمانی بابلی بووە، ئەو نووسینەش بەکارهاتووە نووسینی مێخی بووە، ئەم نامانەش بێگومان یەکێکن لەو ئامازانەی کە سەلماندویانە کاشییەکان و خوریەکان و میتانییەکان و حیسییەکان جاربەجار بە زمانی بابلی دووان و بە نووسینی مێخی نووسیویانە.

هەروەها لە ڕێگەی ئەم نامانەوە توانیومانە بڕی ئەو شیر باییە بزانین کە پادشای میتانی کوشراتا داوای کردووە بە بەرامبەر هاوسەرگیری شازادە تاتوخیپا TATU.HEPAی کچی لە فیرعەونی میسری ئەمینۆفیسی سێیەم، وەك لە خوارەوە پوختەیەك لە وەرگێڕانی لە یەکێك لەو نامانەی لەم بارەیەوە هاتووە.

(بۆنیمۆریا)، پادشای میسر، برام، مێردی کچەکەم، کە خۆشم دەوێ، و خۆشی دەوێم، ئەمەی پێ بڵێ، (فەرمانەکە ئاراستەی ئەو پەیام بەرەیە کە نامەکە هەڵدەگرێت): توشراتا، پادشای ولاتی میتانیەکان خەزوورت = (باوکی هاوسەرت) کە خۆشی دەوێیت، برای خۆت من باشم، هیواخوازم کە تۆش وابیت، هیواشم وایە ژنەکانت و منداڵانیش گەورە و بچووك، ئەسپەکانت، گالیسکەکانت و هێزە چەکدارەکانت و ولاتەکەت و هەرچیت هەیە لە باشیدابن، ئەو برایەم پێویست بوو ژنێك بۆ خۆی بهێنێ بهێنێ، ئەوە تا من بۆ برای خۆمی

ئەنێرم. کاتێك کە دەگات. ئەوا برام دەبینێت چۆن دڵی ویستویەتی ئاوایە، هیوادرایشم کە خەڵکی و پیاوچاکان و نێرراوەکانی کۆببنەوە بۆ ئەوەی ببینن و ئەو دیارییانەش ببینن کە لە گەڵیا نێراوە هیواداریین کە بە هەمان شێوە کچەکەش خۆشحاڵبێت.

بۆ برام خۆم ئەمەوێ شتێکی تر بڵێم تکام وایە براکەم گوێی لێ بێت: ئومێدەوارم کە براکەم لە دیدی وڵاتەکەمدا دەوڵەمەندم کا، بۆیە تکاکارم لە براکەم کە پەیکەرێکی ئاڵتونی بۆ بنێرێ، چونکە من دەزانم براکەم چەند خۆشی دەوێم و لە وڵاتەکەیدا ئاڵتون چەند زۆرە، هەروەها تکام وایە کە براکەم پەیکەرێکی عاجی کچەکەم بۆ بنێرێ....

ئومێدەوارم کە هەردوو وڵاتمان لە ئاشتیدا بژین، و ئەگەر دوژمن هاتە ناو وڵاتەکەوە، ئاگادارم بکەرەوە، چونکە وڵاتی خوریەکان و زرێ پۆشەکان و چەکەکان ئامادەن بۆ پاڵپشتیت، و ئەگەر دوژمن هاتە ناو وڵاتەکەوە، ئەوا نووسراو بۆ براکەم دەکەم، بەوەش وڵاتی میسر و زرێ پۆشەکان و چەکەکان ئامادەباش دەبن بۆ پاڵپشتیم.

وە ئەگەر براکەم قسەیەکی خراپی بیست (بڵێن) لە لایەن منەوە کراوە یان لە لایەن وڵاتەکەوە، ئومێدەوارم کە گوێی لێ نەگری، بەڵام هەرچییەك (کیلیا KELIJA)- (نێردراوی پادشا توشراتا) لە سەر من و وڵاتەکەم بیلێت، ئەوە راستییەکەیە، ئەمەو هەرچیەك براکەم داوای کردبێ من بە دەقات بۆم ناردووە.

هەردوو خواوەند تیشۆب و ئامانو AMANU= (ئاموون)ی گەورەمان بمانپارێزن.

ئەمەو فیرعەون ئەمینۆفیسی سێیەم دوای چەند ساڵێك لە مارە کردنی شازادەی میتانی (تاتۆخیپا)کۆچی دوایی کردووە ئینجا فیرعەون ئەمینۆفیسی

چوارەم کە نازناوەکەی ئەخناتۆنە بۆتە فەرمانڕەوای میسر، زانیارییەکانی بەردەست لە بارەی مێژووی میسرەوە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەخناتۆن خۆی سەرقاڵکردبوو بەو ئایدۆلۆژییا نوێیە ئایینییەی کە لە ڕێگەیەوە بانگەشەی بۆ خواوەند (ئەتون) دەکرد کە لە بازنەی خۆردا بەرجەستە دەبوو، هەربۆیە ئەوەی کە لە گەڵ میتانییەکاندا لە سەری ڕێکەوتبوون پشتگوێ خرا، بە چەشنێك پەیوەندی دیبلۆماسی نێوانیان پچڕا و نێردراوەکانی هەردوولا گەڕانەوە ولاتی خۆیان.

لەم کاتەدا ئاشوورییەکان گەشەیان کرد، و هەستان بە هاوکاری کردنی ئەرتاتاما= (ئوتخی) نەیاری دەوڵەتی میتانی، و وایان لێکرد بتوانێت دەوڵەتێك دابمەزرێنێ لە هێز و توانایدا هاوشانی دەوڵەتی (خانیکلبات)ی میتانی بێت. بەمەش ئاشوورییەکان لە دەسەلاتی میتانییەکان رزگاریان دەبێت، بۆیە دەبینین پادشای ئاشووری (ئاشوور- ئۆبلەت) ١٣٦٣-١٣٢٨پ.ز نامەیەك دەنێری بۆ ئەمینۆفیس چوارەم ١٣٦١-١٣٤٠پ.ز تیایدا پێی رادەگەیەنێت کە رزگاری بووە لە دەسەلاتی میتانییەکان و ئەمینۆفیسی چوارەمیش ئەم رزگاربوونەی پێ خۆش بوو، هەربۆیە ئەتوانین بڵێین کە هەردوو دەوڵەتی ئاشووری و حیسی لەسەردەمی (توشراتا) پادشای میتانیدا گەیشتوونەتە ئاستێکی بەهێزی کە هەریەکەیان دەستی کردووە بە دابڕانی چەند بەشێك لە دەوڵەتی میتانی و خستویەتە سەر سنووری خۆی و، بە هۆی زاڵبوونی حیسیەکان بەسەر ئەو ناوچانەی کە کەوتوونەتە نێوان رووباری ولاتی فورات و دەریای ناوەڕاستەوە، ئەرتاتامای دووەم کوڕی پادشا توشراتا هەستاوە بە کوشتنی باوکی و جڵەوی فەرمانڕەوای کردۆتە دەست، بەلام لە گەڵ ئەوشەدا نەیتوانیوە شتێك بکات سەبارەت بە سنووری دەوڵەتی میتانیی.

له دوای ئەو ئەرتاتامای دووەم پادشا شوتەرنای سێیەم هات، کە توانی (شەتی وازا SHATTIWAZAI)ی، جێنشینی رزگار بکات، باوەڕی وابوو کە پشت بەستنی میتانییەکان بە دەوڵەتی حیسی باشترە لە پشت بەستنیان بە دەوڵەتی ئاشووری.

هەروەها دەرکەوتنی پادشای ئاشووری ئەددنیراری یەکەم و ١٣٠٥-١٢٧٤پ.ز ئەو پادشایانەی دوای ئەو هاتوون توانیویانە بەشەکانی باکوور وڵاتی دۆڵی دووروباری داگیر بکەن تاوەکو رووباری فورات. هەروەها لە رێی نووسینەکانی ئەددنیراری یەکەمەوە زانیمان کە شوترای دووەم بۆتە جێنشینی شەتی وازا لە فەرمانڕەوایدا، بەڵام نووسینەکانی شەلمنسەری یەکەم ١٢٧٣-١٢٤٤پ.ز، ئەوەی بۆ دووپات کردینەوە کە ئەو خانیکلباتی مەڵبەندی دەوڵەتی میتانی لە ناو بردووە و بەوەش کۆتایی بە دەوڵەتی ناوبراو هاتووە.

## بنچینەی ناولێنانی میتانییەکان

لە راستیدا تاوەکو ئەم سەردەمەش یەک دەنگیەك نییە سەبارەت بە بنچینەی ناوی میتانییەکان، بەڵام دەقە نوسراوەکان بە زۆری باسی ناسراوی (مایتا-MAITTA)ی بۆ کردووین، و ئەگەر پاشگری (NI) بخرێتەسەر کە بۆ خستنەپاڵە، ناوەکە دەبێتە (مایتانیMAITTANI ) ئەنجا (میتانی MITTANI)، ئەگەر ئەم لێکدانەوە راست بێت، مانای ناوەکە دەبێتە ئەوانەی سەر بە (میتان)ن، جیاوازی نێوان میتانیەکان و خوریەکانیش تەنها لە ناوە ناسراوەکاندا دەرکەوتووە، بەڵام دەوڵەت هەر یەکە، زۆرجار بەوکەسەی میتانیە، وتراوە خوری و، بەوەی خوریە وتراوە میتانی. هەروەها پادشا میتانییەکان فەرمانڕەوایەتییان نەکردووە لەو ناوچانە نەبێت کە خوری نشین

بوون. ئەمەو لە ڕێی ژمارەیەك لە ناوی خواوەندە میتانییەكانەوە لەوانەش (MITRA)، بۆ توێژەران پشتڕاست بووەتەوە كە میتانییەكان هندۆ و ئەورووپین بەڵام خوریەكان وانین ص١٧٧، و لقێكێكی جیاوازن لە لقی میتانی ئەوەش بەهۆی جۆری ئەو ناوە ناسراونەوە كە پێیانەوە بووە، ئەوەی زیاتر دووپاتی دەكاتەوە كە زمانی میتانی دواتر زۆر جیاواز نەبووە لە زمانی خوری



ئەوەیە کە ماوەی نێوان خوریەکان و میتانییەکان زۆر درێژ نییە بە چەشنێك کە جیاوازییەکی گەورە بخاتە نێو زمانی هەردوو نەتەوەکەوە لەبەر ئەوەی زۆر ئاسان بوو کە میتانیەکان و خوریەکان دوای ماوەیەك لە یەکتر تێبگەن، جیاوازی لە ناوە ناسراوەکانیشدا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خوریەکان ناوانێکیان لێنراوە کاریگەر بووە بەو ناوچانەی تێیدابوون لە نێوان زاگرۆس و دەریای ناوەراستدا، بەلآم ناوە میتانییەکان هەر سروشتی ئەو ناوچانەی هەلگرتووە کە لێیەوە هاتوون.

## نائیری و ئۆرارتیەکان:

یەکەم ئاماژە بۆ ئۆرارتییەکان لە تابلۆیەکی ئاشووریدا هاتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزەیەمی پ.ز، و ئەو شوێنەوارەی لە سالآنی دوایدا لە ناوچە کوردی و ئەرمەنیەکاندا دەرهێنراون ئەوە دەسلمێنن کەئەوان لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زایندا هێزێکی رامیاری دیاری نواندووە لە باکووری میزۆپۆتامیادا.

ئۆرارتیەکان لە سەرەتادا کۆمەلّە هۆزێك بوون شوانکاری و کشتوکالّ و بەخێوکردنی مالآت و ئەسپیان دەکرد، ئەنجا دەستپێکی بەکارهێنانی برۆنز بوون لە پیشەسازیدا وەك چۆن شوێنەواری گۆرەکانیان ئەوەیان بۆ سەلماندین، کشتوکالّیش لای ئەمان دەستی بە پەرەسەندن کردووە بە تابیەت لەو ناوچانەی کە دەکەوتنە لێواری ئەو رووبارە باشووریانەی نزیك ولآتە قەفقازیەکانەوە، ئەویش ئەو کەرەستانە دەیسەلمێنن کە لەوێ بینراون وەك داس، عەماری دانەوێلّە و، هەندێك لەو پیشەسازیە بەردینانەی هونەریان تیا

بەکارهێناوە و بەکاریان هێناون وەك کەرەستە بۆ بەروبوومە کشتوکاڵیەکان و زۆربەشیان لە بەردە ئۆبسیدیەکان بوون.

بە گشتی شوێنەواری جۆرا و جۆر دۆزراونەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئۆرارتییەکان کە زۆر لە ناوچەکانی نێوان شاخەکانی قەفقازیا و میزۆپۆتامیا دەگرێتەوە، لە سەدەی سیازدەیەمی پێش زایین، ئەو کاتەی ئاشوورییەکان هێرشەکانیان بەرەو باکوور بەرپاکرد، لەویێ هەندێ لە یەکێتیە هۆزگەریەکانیان بەرچاوکەوت، ناوبانگترینیان یەکێتی هۆزەکانی (دیاوخ) بوو کە تیرەکانی لە باکووری رۆژئاوای دەریاچەی وان و ناوچەکانی سەرەوەی رووباری فورات نیشتەجێ بوون. هەروەها لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی دەریاچەی وان بەرەو دەریای قەزوین هۆزی دیکە ژیاون – لێرەدا ئەوەی شایەنی باسە مانییەکان لە باشووری ئۆرارتییەکانەوە ژیاون و لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایندا بوونەتە هێزێکی رامیاری دیکە لە ناوچە کوردییەکانی باشووری دەریاچەی وان، لەو ململانێدا بەرامبەر بە ئۆرارتیەکان وەستاونەتەوە و ئۆرارتیەکان توانیان ناوچەکانی سەرووی رووباری زێ ی گەورە و چەند بەشێك لە کوردستانی عێراق و ئێران داگیر بکەن، ناوچەکانی دەوروبەری ڕەواندوزی ئێستا لە دیدی ئۆراتیەکاندا پیرۆز بووە ئەوەش بەهۆی بوونی پەرستگای گەورەی خواوەندی گەورەیان (خەلدی) تیایدا، ئۆراتیەکان ئەو شارەی کە پەرستگای تیادا بووە پێیان وتووە (ئەردینی) کەچی ئاشوورییەکان بە ناوی (موساسیر)ەوە تۆماریان کردووە.

شانشینی ئۆرارتی لە دەوروبەری دەریاچە واندا دەرکەوتووە، هەربۆیە لە مێژوودا بە شانشینی وانی ناسراوە، ئەم ناوچانەش مەڵبەندی ولاَتی خوریەکان پێکدێنن، و دانیشتوانیش لە چوارچێوەی یەکێتیە هۆزگەریەکانی نێوان هەردوو

دەریاچەی وان و ورمێ دا ژیاون، ئەو سەرکردە ناوخۆیانە پێشەوایەتیان دەکرد کە ئاشوورییەکان نازناوی پادشاکانی ولآتی نائیری و ئۆراتیەکان پێوە نابوون. لە ڕووی رامیاریەوە یەکێتی ئەم هۆزانە لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینـدا روویداوە، و لەو کاتەشەوە کەوتونەتە نێو شەڕ و شۆڕەوە لە گەڵ هێزە رامیاریەکانی دیکەی دەوروبەری ولآتەکەیان بە تایبەت لە گەڵ ئاشووردا.

لە درێژەی باسەکەماندا سەبارەت بە سووئیەکان و ولآتی سۆبارتۆ، وتمان: ناتوانین سنورێکی دڵنیاکەر دیاری بکەین بۆ ناوچەی سۆبارتۆ، بەلآم ئەتوانین بڵێین دەکەوێتە نێوان چیاکانی زاگروس لە لای رۆژهەلآتەوە و رووباری خاپوور لە لای رۆژئاواوە. هەروەها وتمان ئەم ناولێنانە بەو ناوچانە دەوترا کە دەوڵەتی ئاشووری تیادا بوو، بەلآم ئاشووریەکان ناوی سۆبارتۆیان لە ولآتەکەیان نەناوە و بە بەشەکانی باکوری سنووری ئیمپراتۆریەتەکەیان وتووە شوبریا، ئەنجا ناوی ولآتی نائیریان لێناوە، و بەو ناوچانە دیاریدەکەن کە دەکەونە نێوان سەرچاوەکانی هەردوو رووباری دیجلەو فوراتەوە، هەربۆیە ئاشووریەکان ناوی دەریای نائیریان لە دەریاچەی وان ناوە.

لە رێی نووسینە مێخیەکان قۆناغی نێوان ١٨٠٠–١٥٠٠پ.ز بۆمان دەرکەتووە کە ولآتی ئەمینیا بە بەشێك لە ولآتی نائیری دانراوە و لە لایەن چەند گروپێکی گەورەی خوریەکانیشەوە نیشتەجێ کراوە، بۆیە زمانی باو لە ئەرمینیا نزیك بووە لە شێوەی زمانی خوریەکانەوە بە چەشنێ: هەندێ لە توێژەرەکان زامنی ئەرمینی (واتە: ئۆراتی) بە دیالیکتێکی نوێی دیالێکتەکانی زمانی خوری هەژمارکردووە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی سیازدەیەمی پێش زایین ناوێکی نوێ بۆ ئەرمینیا بەدەرکەوت و بە ئۆراتۆ ناسراوبوو، ولآتی ئەرمینیای دەگرتەوە

تـاوەکو دەریاچـەی وان، بـەڵام ناوچـەکانی نێـوان سـەرووی هـەردوو رووبـاری دیجلەو فورات لە لایەن ئاشووریەکانەوە وەکو جاران پێی دەوترا وڵاتی نـائیری، باشترین بەڵگەش بۆ ئەوەی هەواڵی پەلامارە سـەربازیەکانی پادشـای ئاشـووری ئـــەددنیراری دووەم (٩١٢-٨٩١پ.ز) و نووســینەکانی تۆکۆلــوتی نینورتــای دووەمــی کرێتــی (٨٩١-٨٨٤پ.ز) کـە بـەم وڵاتــەی وتــووە وڵاتــی نــائیری، سەبارەت بە ناوچـەی ئۆرارتـۆش ئـەوا هێـزی لـە پەرەسـەندنا بـووە لـە مـاوەی نێوان فـەرمانڕەوایی پادشـای ئاشـووری ئاشـوور بـل کـلا (١٠٨٢-١٠٦٦)پ.ز و پادشا شەلمنسەری سێیەم (٨٥٨-٨٢٤پ.ز). کاتێکیش گەشتە لوتکـەی هێـزی وەختبوو هەموو ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەراست بخاتە ژێر رکێفـی خۆیـەوە و لـە پادشــا ناســراوەکانی، ســاردوری یەکەمــە (دەوروبــەری ٨٣٢-٨٢٥پ.ز) کـە هاوچەرخی دوا ساڵەکانی فەرمانڕەوایی پادشای ئاشووری شەلمنسـەری سـێیەم بـووە و ئـەم پادشـایە نووسـینێکی بـۆ بەجێهێشـتووین لـە سـەر یـەکێك لـە بەردەکانی ئەو شورایەی دروسـتی کردبـوو، تیایـدا هـاتووە: "پادشـای گـەورە، پادشای بەهێز، پادشای جیهان، پادشـای وڵاتـی نـائیری، کـە هاوشـێوەی نیـە، ئەو چاودێرەی لە جەنگ ناترسێت، وەکۆیلـە کـاری هەڵگەراوەکانـە" لـە جـۆری ئەو زمانەی کە ئەم دەقەی پێ نوسـراوە و، زمـانی بابلیـە، بـە روونـی زاڵبـوونی کەلتووری بابلیمان بۆ دەردەکەوێت بە سە ر ناوچەکەدا.

لە دوای ساردووریی یەکەم (ئیشپونی ISHPUNI ٨٢٤-٨٠٦پ.ز) کـوڕی بوو بە جێنشینی، ئەوەی ئەم پادشایە لە بـاوکی جیادەکاتـەوە ئەوەیـە کـە بـە زمـانی ئـۆرارتی نوسـینەکانی نووسـیوە، ئەمـەش لـە راسـتیدا ئاماژەیەکـە بـۆ ویستی لە بنیادنانی دەوڵەتەکـەی، بنایتنانێك کـە پشـت بـە شـتە ئۆرارتیـەکان ببەستێت، ئەشپوونی سەرکردایەتی چەند هەڵمەتێکی کـردووە بـەرەو بـاکوور و

نوسینێکی سەربەردی بۆ بەجێهێشووین لە سەر ڕێڕەوی شاخاوی (دێلی بابا — DILIBABA) ئەم پادشایە نووسینێکی دیکەی هەیە تیایدا باسی لە هێرشێکی سەربازی کردووە کە ١٠٦ گالیسکەی جەنگی و ١٠٠٠ سوارچاك و زیاتر لە ٢٢ هەزار سەربازی پیادەی کردووە، هەڵمەتەکەش بۆ سەر ناوچەی بارس= (فارس) بووە کە دەکەوێتە باشووری دەریاچەی وانەوە. ورمێوە.

هەروەها لە سەر ڕێگەی نێوان ڕەواندوز و شاری (ئۆشنو) نووسینێکی تۆمارکراوی دیکەی بە زمانی ئۆراتی و ئاشووری لە ڕێرەوی (کێلی شین KILI.SHEN) بۆ بەجێ هێشتووین ناوەڕۆکی نوسینەکەش پێکهاتووە لە باسی ئاپۆرایەك کە (مینوا _MENUA)ی کوری پێی هەستاوە لە ناوچەی مەساسیر (مەجیسیری ئێستا) و شوێنی ئەم نووسینەش ١٠٠ کیلۆمەتر لە هەولێرەوە دوورە.

لەو نازناوانەش کە ئەم پادشایە بەکاری هێناون لە نووسینی ناوبراودا نازناوی: پادشای وڵاتی بیاینا کە لە دەقی ئاشووریدا (پادشای وڵاتی نائیر) بەرامبەریتی، هەروەها نازناوی ((گەورە شاری توشپا (ن)—TUSHPA(N)) یشی بۆ خۆی بەکارهێناوە کە پایتەختی دەوڵەتی ئۆرارتیە.

نووسینەکانی دیکەی ئەم پادشایە ژمارەیەك لەو خواوەندانەی پێ ناساندین کە لە ناوچەی ئۆرارتۆدا پەرستراون و ناوی هەندێکیشیان پێ ناساندوین، ئەشپونی قوربانی بۆ ٧٠ خواوەند کردووە و لێیان باسی ئەمانەی کردووە (تیشیبا TESHEBA) خواوەندی کەش کە بەرامبەر بە (تیشوپ—TESHUP)ە لای خوریەکان، هەروەها باسی ناوی (شیوینی—

(SHELARDI– خواوەندی خۆری کردووە، و (شیلاردی –SHIWINI) خاوەندی مانگ.

لە دوای ئەشپونی (مینەوا)ی کوری هاتووە لە دەورووبەری ٨٠٥پ.ز، کە لە ولاتی ئاشووردا پادشا ئەدد– نیراری سێیەم ٨١٠–٧٨٩ پ.ز هاوچەرخی بووە، و سەرەرای ئەوەی کە خودی مینەوا نازناوی گەورەی تۆشبای لە خۆی ناوە، کە پایتەختی دەوڵەتەکەیە کەچی هەستا بە بنیاتنانی پایەتختێکی نوێ کە ناوی خۆی لێ ناوە و دەکەوێتە سەرچاوەکانی رووباری (کرا–سو)ەوە ئەوەش (مینەوا خینیلی)یە، لە راستیدا گەورەبوونی شانشینی وانی بوو بە مەترسییەك لە سەر ئاشوور بە تایبەتی ئەو کاتەی هێزەکانی هۆزە جیاجیاکانی دانیشتووی ناوچەکانی باکووری ئاشوور لە ژێر فەرمانرەوایی پادشا ئۆرارتیەکاندا یەکیان گرت.

لەوێ ئەو رێگە بازرگانیانەیان گرت کە بەرژەوەندی ئاشوورییەکان دەبەستێتەوە لە گەڵ ولاتی ئاسیای بچووك و باکووری سوریاوە، بۆیە پادشا ئاشوورییەکان دەستیانکرد بە هەڵمەتی سەربازی بەرە و ئەم ناوچانە بۆ گۆرینی ئەو دۆخەو کۆنترۆڵکردنی رێگا بازرگانیەکانی، لە سەدەی هەشتەمی پ.ز ئاشوور دژ بە شانشینی وانی و هاوپەیمانانی هێزەکانی خۆی کۆکردەوە، ئەنجا پادشا تجلات پلاسەری سێیەم دوو هەڵمەتی کردەسەر ئەم شانشین و ئەم دوو هەڵمەتەش گورزێکی بەهێزبوو و کاریکردەسەر شانشینی ئۆراراتی، بۆیە پادشای ئۆرارتی روسای یەکەم (٧٣٠–٧٤١پ.ز) هەوڵیدا فەرمانرەوایی خۆی لە ناوچە قەفقازییەکاندا توندو تۆڵ بکات، و هەندێ قەلای لە دەوری شاری بایەزیدی ئێستای بنیاتنا، لە گەڵ ئەوەشدا قولفی یەکگرتنەکە لە ولاتی

ئۆرارتۆ بچرا، و شانشینی جۆرا و جۆر بە دەرکەوتن کە سەربەخۆبوون لە پادشاکانی تۆشبای پایتەخت.

لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا، ئاشوور دەستی کرد بە جموجۆڵ دژ بە ئۆرارتۆ و چەند هەڵمەتێکی برد بۆ سەری، وەك هەڵمەتی پادشا سەرگۆنساڵی ٧٤١پ.ز کە لە نووسراوەکانیدا باس لە دیلکردنی ٢٦٠ کەس دەکات لە گەڵ خێزانەکانیدا و خاپوور کردنی شارەکانیان، ئەوجا پادشای ئۆرارتی روسای یەکەم لە دوای ئەو شەڕانە خۆی کوشت و ئاشووریەکان بەشێك لە وڵاتی ئۆرارتۆیان خستە سەرخۆیان بەڵام ناوچەکانی دیکەی ئەم وڵاتە، سکیسیەکان و کیمیریەکان داگیریان کرد، و ئەنجا مادییەکان کۆنترۆڵیانکرد و لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی پ.ز، بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی مادی دامەزرا.

هەر لە رێگەی یەکێك لە نوسوراوەکانیەوە لە شاری (تاش تەپە -TASH TEPE)لە باشووری دەریاچەی ورمێ بۆمان دەرکەوتووە کە توانیوێتی زۆرێك لە ناوچە ئاشووریەکان بخاتە سەر سنووری دەوڵەتەکەی. دوای مینەوا ئارکشتیی یەکەمی کوڕی بوو بە فەرمانڕەوا لە دەوری ٧٨٩-٧٦٦پ.ز و ئەم پادشایەش رێبازی باوکی گرتەبەر و چەندین هەڵمەتی سەربازی ئەنجامدا، کە بەهۆیەوە نوسراوی لە هەموو ئەو ناوچانە بەجێهێشتووە کە پێی گەشتووە و توانیوێتی زاڵبێت بە سەر هەموو دەشتەکانی ئارارات و سەرچاوەکانی مس لە قەفقازیا، کە ئەوەش بوو بە یارمەتیدەری بوژانەوەی پیشەسازی مس. لە کارە گرنگەکانی دیکەی (ئارگشی) بنیاتنانی شارێکی تۆکمە لە سەر لای چەپی رووباری (ئەراگیس ARAXES) بوو و ناوی لێنا ((ئارکشی خینیلی -ARGISHI HINILL) لە نێو شوێنەواری ئەم شارەشدا چوارەدە دەقی نوسراو دۆزراونەتەوە هەمووی باس لە کارە کشتوکاڵی و بیناسازیە زۆرەکانی دەکات.

پادشا ساردۆری سێیەم ٧٦٥-٧٣٣ پ.ز بووەتە جێنشینی ئاکیشی باوکی بۆ فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئۆرارتی، و توانی بەردەوام بێت لە فراوانکردنی سنووری دەوڵەتەکەی، بە چەشنێك گەشتە کەنارەکانی دەریای رەش و تاوەکو بەرزاییەکانی رووباری فورات، بەڵام هاتنی پادشا تجلات پلێزەری سێیەم بۆ حومکرانی دەوڵەتی ئاشووری و توانستی بۆ پێدانی هێزێکی گەورە بە دەوڵەتی ئاشووری، ئەوەش بووە هۆی وەستانی دەوڵەتی ئۆرارتی لە بەردەوامبوونی فراوانکاریدا، ئەمەو ئەو هەڵمەتانەی کە پادشا ساردۆری سێیەم کردی توانی برێکی زۆر دەسکەوت بە دەستبێنێ کە بە پێی وتەکانی خۆی گەشتۆتە ٣٧٨٠٠ دیل و ٣٥٠٠ ئەسپ و ٤٠٣٥٣ سەر ولاخ و ٢١٤٧٠٠ سەر ئاژەڵی بچووك.

پاشان ساردۆری سێیەمیش نوسراوێکی لە بەرزاییەکانی رووباری فورات بۆ بەجێهشتووین تیایدا هاتووە کە گەشتووەتە ناوچەیەك هیچ پادشایەکی ئۆرارتی پێش ئەو پێی نەگوشتووە و توانیویەتی پادشای (مەلا تیاMALATIA) بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بۆ زانیاری (مەلاتیا) لە لای ئاشوورییەکان پێی دەوترێت "کۆمۆخو- KUMMUHU) و توانی پادشاکەی (کوستاشبیلی) ملکەچ بکا، کە پادشا ساردۆری سێیەم بەوە وەسفی دەکات کە پێشتر نەچووەتە ژێر دەسەڵاتی کەسەوە و سەرانەی بە کەس نەداوە، بەڵام ساردۆر ئەم دەسکەوتانەی لێ برد: ٤٥ منا (منا= ٥٠٥ غم) ئاڵتونی پاکراو و ٨٠٠منا زیو و ٣٦٠٠ پارچە قوماش و ٢٠٠٠ سوپەری برۆنزی و ١٠٢٥ دەفری برۆنزی، کۆتایی دەوڵەتی ئۆرارتیش لە سەر دەستی ئیمپراتۆریەتی نوێی ئاشووری بوو کە هەریەك لە تجلات پلێزەری سێیەم ٧٤٤-٧٢٧پ.ز و سەرگۆنی دووەم ٧٠١-٧٠٥ پ.ز دایانمەزراند.(٦٦)

## مانیەکان:

لـە کۆتـایی سـەدەی هەشـتەمی پـێش زایـنـدا هەنـدێك لـە فـەرمانڕەوایانی هەرێمەکانی ژێر دستەی دەوڵەتی ئۆرارتی دەستیاندایە یاخیبوون، بە تایبـەتی لـە سەردەمی پادشا روسای یەکەمدا. ئـەم رەوشـەش بـوو بـە هـۆی لاوازی دەسـەڵاتی ناوەنـد لـەو هەرێمانـەدا. لـە لایـەکی تـرەوە ئاشـوور دیسـانەوە هێزەکـانی بـە دەستهانی، و پادشا سەرجۆنی دووەم هەڵمەتێکی بەهێزی بردە سەر ولأتی ئۆرارتـۆ لـە سـاڵی ٧١٤پ.ز کـە تیایـدا بـە یـەکجاری سـوپای ئـۆرارتی لـە نـاوبرد، کەچـی شانشـینی ئـۆرارتی هـەتاوەکو سـەردەمی روسـای چـوارەم ٥٩٠-٥٨٥ پ.ز مایەوە.(٦٧)

لە گەرمەی ئەم رووداوانەدا ئەو هەرێمانەی سەر بە ئۆرارتـۆ بـوون جیابوونـەوە و دیارترین هەرێمیش ئەوەبوو کە بە ولأتی (ماننا) ناوبانگی دەرکردبـوو کـە دەکەوێتـە باشووری دەریاچەی ورمێوە لـە کوردسـتانی ئێـران. ئـەو شانشـینەی کـە لـە ولأتـی ماننادا دامەزرا لە سەردەمی سەرگۆنیدا بە شێوەیەکی گشـتی لـە نێـوان گشـت ئـەو شانشینە خۆماڵیەی کـە لـە کوردسـتاندا دامـەزرابوون جێگایـەکی دیـاری هـەبوو بـە شێوەیەکی گشتی چ لە لایەنی رامیاریەوە یـان شارسـتانی، وای لێهـات ململانێـی لـە گەڵ ئەو رووداوانە دەکرد کـە لـە دەورو پشـتییەوە سـەریان هەڵدەداوە راسـتەوخۆ بەشـداریکردووە لـەو ململانـێ رامیـاری و سـەربازییانەی کـە لـە نێـوان دەوڵـەتی ئاشووری و ئۆرارتیـدا سـەریهەڵدا. سـنووری شانشـینیماننـا لـە بـاکوور و بـاکووری رۆژئـاواوە دراوسـێ بـووە لـە گـەڵ شانشـینی ئۆرارتیـدا، لـە باشـووری رۆژئـاوا و رۆژئاواشەوە سنوورەکەی لە گەڵ ئیمپراتۆریەتی ئاشووریدا تێکەڵ بووە، چـونکە لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی هەشـتەمی پـێش زاییـنـدا بەشـێك لـە ولأتـی زامـوا (زێـدی

لۆلۆبیەکان) ناویماننای وەرگرت و هۆزە مانئیەکانیش لەرووی ڕامیاریەوە لەم ولأتەدا بانگەشەی یەکێتی هۆزگەریان دەکرد.(٦٨)

لە مێژوودا ناوی ئەم شانشینە بەم شێوانە هاتووە "مانا، ما ننا، مننا، مننـاش" لە تەوراتیشا ناوەکە بەم شێوەیە هاتووە "مننی" کە گەنمی باش لە فەلەستیندا بە "گەنمی مننی" ناوبانگی دەرکردووە. ئەم شانشینە لە سەرەتادا ئەو ناوچانەی لە خۆی دەگرت کە ئێستا حەوزی رووباری (جگتۆ) پێکدێنێت، و پایتەختەکەی شاری "ئیزەرتۆ-زەرتە" ی کوردستانی ئێرانە. ئاشووریەکان بۆ یەکەمجار هەواڵی ئەم شانشینانەیان لە ساڵی ٨٣٤پ.ز باسکردووە ئەوەش لە کاتی هەڵمەتەکانیدا بوو بۆ سەر ئەو دەڤەرانە لە میانەی شەڕەکانیان لە گەڵ ئۆرارتیەکاندا، ئەوەش بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی دەسەلأتی ئۆرارتی لەوێ، بەلأم شانشینی ماننی سەرباری شەڕو شۆڕی یەك لە دوای یەکی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی ئاشووری و ئۆرارتی لە سەر خاکەکەی توانی پارێزگاریی لە کەسایەتی ڕامیاری بەرزی خۆی بکات. لە ساڵی ٧١٩پ.ز و هەروەها ساڵی ٤١٧پ.ز یشدا دەسەلأتدارانی هەرێمەکانی هۆزانی (زیکرتۆ)ی میدی شوانکاریی، جەنگی، هاوپەیمانیان لە گەڵ ئۆرارتییەکاندا بەست و رووبەرووی پادشا ماننایەکان بوونەوە، بەلأم مانئیەکان توانیان هاوپەیمانی لە گەڵ ئاشوورییەکاندا ببەستن و دوژمنەکانیان لەناوبەرن، و لە دوای سەرکەوتنی گەورەیان بەسەر هۆزەکانی (زیکرتو)دا دەوڵەتی ماننا هەر لە ساڵی ٤١٧پ.ز ناوی بەرز و گەورە بوو.(٦٩)

بەم چەشنە مانئیەکان هەموو ئەو هەرێمانەی دەکەونە نێوان دەریاچەی ورمێ و رووباری ئاراسەوە لە سنووری قەفقەزیا "واتە: کوردستانی تورکیای ئێستا" خستەسەر شانشینی خۆی، لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایندا، پانتای ئەم شانشینە فراوانتر بوو بەرە و رۆژئاوا و تا سنوورەکەی گەشتە رووباری

زێــی گــەورە لــە بــاکووری هــەولێر، بــەوەش ئــەم شانشــینە زۆربــەی ناوچــەکانی کوردســتانی ســەردەمی ســەرگۆنی دەگرتــەوە. بــەلام لــە گــەڵ دەســپێکی ســەدەی هەشــتەمی پــێش زاییــنــدا چــەند پادشــایەکی دەوڵــەتی ئــۆرارتی وەدەرکــەوتن کــە توانیان فراوانکاری مانی و ئاشووری بۆ ناوچە ئۆرارتییەکان بوەستێنن. سەرباری کەمی سەرچاوەکان کەچی نوسراوە ئۆرارتیەکان، وەك بینیمان، ئامـاژەی کـردووە بەو هەڵمەتانـەی پادشـا ئۆرارتیـەکان (خەلدیـەکان) کردویانەتـە سـەر هەریـەك لـە کوردستانی ئێران و عێراق، لەوانەش نووسراوەکانی پادشا ئەشپوینی و مینەوای کـوڕی کـە لـە کێلـی–شـین سـالّی ٨١٠پ.ز دایاننـاوە وەك سـەرەتایەك بـۆ ئـەو فراوانکاریـە. پادشـا مینـەوا ئـەو ناوچـانەی داگیرکـرد کـە دەکەونـە بەرزاییـەکانی رووبـاری دیجلـە و زێـی گـەورەوە و هـەروەها ئـەو ناوچـانەی دەکەوتنـە شانشـینی مانییەوە لە باشووری دەریاچەی ورمێ لەوانەش ناوچەی شنۆی ئێسـتا، هەریـەك لـە ئەشپوینی و مینەوا توانیان ئیمپراتۆریەتێك دابمەزرێنێت رووبەرەکـەی یەکسـان بێـت لە گەڵ ئیمپراتۆریەتی ئاشووری و هەندێ جاریش لەو گەورەتر بووە.

لە سالآنی ٦٦٠–٦٥٩پ.ز رەوشی ولآتیماننا زیاتر ئالۆز بوو، لـە دواییـدا بـووە هــۆی راپــەرینێکی جــەماوەری دژی دەســەلآتی حــوکمران تیایــدا و، لــە دەرەنجامەکانیشی کوشتنی پادشا "ئەخشێری" بوو، هەروەها پادشـا "ئـو ئـەللی" پــەنای بـۆ ئاشـوورییەکان بـرد بـۆ یارمەتیـدانی لـە گێڕانـەوەی ب دەسـەلآت لـە ولآتەکەی بەرامبەر بە پێدانی سەرایەکی دیاریکراو هەموو سالێك.(٧٠)

بەم چەشنەش دەوڵەتی مـاننی بـوو بـە هاوپـەیمانی ئاشـوورییەکان، و لـە گـەڵ گەڵیانـدا بەشـداری بەرەنگاربوونـەوەی دەوڵـەتی کلـدی کـردووە لـە بابـل و کەوتـە ململانێ لە گەڵیاندا. لـە لایـەکی تـرەوە دوو کێشـەی گرنگـی هـەبوو، ئـەوانیش ئـەو مەترسـیە بـوو کـە لـە لایـەن یـەکێتی هۆزگـەری میدیـەوە لـە لای رۆژهـەلآت و

باشوورەوە سەریهەڵدا بە تایبەت لەسەردەمی دیاکۆ و خشتریتا کە هەردووکیان میدی بوون، ئەنجا ئەو ناکۆکیە ناوخۆییانە لە نێوان خودی سەرکردە ناوخۆییە مانییەکان هەبوو لەسەر دەسەڵات. لە راستیشدا مانییەکان لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا بە سەر ئاشوورییەکاندا زنجیرەیەك سەرکەوتنیان بە دەستهینا پێش ئەوەی هاوپەمانی ببەستن. بەڵام هاوپەیمانی هۆزە سکیسییەکان "سیسییەکان" لە گەڵ ئاشوورییەکاندا ساڵی ٦٧١–٦٧٠پ.ز باری رامیاری و سەربازی لە وڵاتیماننا ئاڵۆزکرد بە تایبەتی لەو کاتەی سکیسیەکان دەستیاندایە کۆچکردن بەرە و ناوچە مانیەکان لە باکوورەوە وەك چۆن هۆزە میدیەکان لە باشوورەوە دەستیان پێکرد.

لە دواجاردا و لە جەنگی "کابلینا"دا هێزە هاوبەشەکانی ماننی لە گەڵ ئاشوورییەکاندا شکستی خوارد بەرامبەر هێزەکانی شاری بابلی (ئەبو بولاسر) لە سەر رووباری فورات. ئەنجا میدیەکان کۆنترۆڵی هەموو وڵاتی مانیایان کردو تاڵانیانکرد بەوەش مانییەکان لە رووی ڕامیارییەوە کەوتنە ژێر رکێفی میدیەکانەوە لە ساڵانی ٥٩٠–٥٨٠پ.ز ئەم وڵاتە بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی میدی.

تاوەکو ئێستا مێژووی مانییەکان نەکەوتۆتە بەرباس و لێکۆڵینەوەوە، ئەوەشی لەسەریان دەیزانین لە رێگەی ئەو شوێنەوارە دەگمەنانەوە دەیزانین کە لە زێدی رەسەنی خۆیاندا بە جێیان هێشتووە یان لە رێگەی ئەو تۆمارە ئاشووریانەی کە بۆ سەردەمی سەرجۆنی دەگەڕێنەوە.

دانیشتوانی ئەم وڵاتە لە گرووپی هۆزگەریی سەقامگیر و شوانکاری تا ڕادەیەك زمان جیاواز پێکهاتوون، و لە رەچەڵەکیشدا لە گۆتیەیکان و لۆلۆبیەکانەوە هاتوون بگرە لە خورییەکانیش، بەڵام لە رووی زمانەوە بەو هێندۆ ئاریانە کاریگەربوون کە لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایندا کۆچیان بردە وڵاتەکەیان کە بەشێکیان

توانیان لە باکووری دۆڵی دووڕووبار دەوڵەتیماننی بنیاتبنێت، بگرە هەندێکیان لە ڕێگەی وڵاتی مانناوە گەشتنە وڵاتی کاشیەکان. ئەنجا لە نێو هەمان ڕەگەزدا بە تەواوەتی توانەوە لە هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا لەو کاتەی هۆزە میدی و سکیسیەکان چوونە ناو وڵاتەکەیانەوە. بگرە لە ڕاستیدا دەوڵەتی ماننا بە کرۆکی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی میدی هەژمار دەکرێت، لێرەدا شیاوی باسە کە نەمانی هەردوو دەوڵەتی ئۆرارتۆ و ئاشوور لە ئاکامی هێرشی میدیەکان و سکیسیەکان و کیمیریەکان نەبوو ئەوەندەی دەرەئەنجامی ئەو ململانێ درێژە بوو کە لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا ڕوویدا، کە شانشینی ماننا بۆ ماوەیەکی درێژ بەشداری تێداکرد، بەڵام گورزی کوشندە بە هاوبەش لە لایەن میدیەکان و بابلییەکانەوە هات. ئەگەر بابلییەکان گەورەترین ناوچەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکانیان بۆ مایەوە، ئەوا میدیەکان گشت ئەو سەروماڵانەی دەستکەوت کە بۆ ئۆرارتۆ و ماننا دەگەڕایەوە لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشووردا.

لە لایەنی بنیاتی ئابووری نەتەوەیی دەوڵەتی مانناشەوە، ئەوا لە بەخێوکردنی ئاژەڵ و شوانکاریدا خۆی دەنواند، ئەوانەش لەم وڵاتەدا، لە کارە گەشەسەندووەکانە و لە ناویاندا بەخێوکردنی ئەسپ. ئەمەو لە پاڵ بەڕێوەبردنی کێڵگەکاندا گەنمە بە ناویانگەکەی گەواهی بۆ دەدات کە لە کتێبی پیرۆزدا بە ناوی خۆیەوە ناوبانگی دەرکردووە هەروەها لە ڕێگەی دۆزراوە کانزاییەکانی ناوچەکانی باشووری دەریاچەی ورمێوە شارەزای ئاستی بەرزیی پیشەسازی کانزا دەبین، لە شارە مانناییەکاندا، ئەم پیشەسازیە ئەو ئاستە دەردەخات کە بابەتی ژیانی هونەری لەم وڵاتەدا پێیگەیشتووە کە هەندێ جار هاوشانی هونەرە ئۆرارتی و ئاشوورییەکانیش بووە، لەوانەیە ئەوەی لە شاری سەقز و زێویێ و شوێنی دیکەی

شاره کوردییەکانی ئێران دۆزراونەتەوە لە کەرەستەی شوێنەواری، بەڵگەیەك بن بۆ ئاستی ژیاریماننیەکان کە جوانترین کاری ناو مۆزەخانەی ئێرانە.

لە دووری ٤٢کم لە ڕۆژهەڵاتی شاری سەقزەوە، چەندین شاری ماننی هەبووە کە لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی مانیەوە بووەتە بنکەیەکی گرنگ و مەڵبەندێکی ئابووری بەناوبانگی میدیەکان و، لە ئاکامی پەرەسەندنی پەیوەندی ئابووری ناو شارە ماننیەکان لە شانشینی ماننیدا لە پاڵ چینە کۆمەڵایەتییەکانی تردا، چینێکی ئەروستوکراتی دەرکەوت. ئەم دیاردەیەش بوو بە هۆکاری زۆربوونی گرژی نێوان تاکەکانی ئەم چینانە و لایەنێکی گرنگیش بوو لە ململانێی رامیاری ناوخۆی نێوان پێڕە سەرەکیەکانی چینی فەرمانڕەوا و دانیشتوانە ئازادەکاندا و لە دەرەنجامەکانی بەرپابوونی راپەرینی ساڵی ٦٦٠-٦٥٩پ.ز بوو، کە بە شێوەیەکی نەگەتیف کاری کردە سەر خودی شانشینەکەو ڕووخانی لە مێژوودا.



هەندێ لە کارە هونەریەکانی مانیەکان لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پ.ز.



**ملوانکەیەکی ئاڵتونی لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پ.ز لە کارە هونەرییەکانی مانیەکان.**

## کاردۆخیەکان:

کاردۆخییەکان لە باشووری رووباری (بەهتان سۆ) لـە کوردسـتانی تورکیـا و لە پاش ئەوەی ئەم رووبارە دەڕژێتە دیجلەوە ئەمەی دواییان سـنوری رۆژئـاوای ناوچـەی کاردۆخیـەکانی پێکـدەهێنا، و سنوورەکەشـیان لـە باشـورەوە بـە تەواوبوونی ناوچە بەردینەکان نزیك بە گوندی مەنسوریە کۆتایی دێـت. بـەوەش زێـدی کاردۆخیـەکان ناوچـەی بـەهتان (بۆتـان)ی کـوردیی لـە تورکیـا دەگرتەوە(٧١). گریکەکان لە کاتی گەڕانەوەی ئێگزەینەفون و گەشتە دەهـەزار یۆنانیەکە دوای جەنگی کۆناکسا لە نزیك بابل ساڵی ٤٠١پ.ز لـە نێـوان کۆرشـی ئـەخمینی و براکـەی ئەرتاکسـێرس (ئەردەشـێر) پادشـا. ئێگزەینـەفۆن لـە

کتێبەکەی (ئەناباسیس) دا لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ یۆنانی وڵاتی خۆی وەسفی سروشتی شاخاوی ناوچەی کاردۆخییەکانی کردووە پێش ئەوەی بچێتە ئەرمینیاوە و باس لە ئەو شەڕە دەڕندەیە دەکات کە لەم ناوچانەدا ڕووبەڕووی یۆنانیەکان بۆتەوە.

لە دوای ئێگزەبنەفون بە دەگمەن ناوی کاردۆخییەکان باسدەکرێت، و هەندێك لە مێژوونوسانی ڕۆمان ناوی هێناون وەکو بلینۆس و دیودۆرسی سەقلی و جگە لەمانیش(٧٢)، ئەنجا لە نوسراوە ئارامیەکاندا لە چاخی مەسیحیدا ناوی کردۆ (قردو) بوو بە چەمکێکی جوگرافی و لە نووسینە عەرەبیە ئیسلامیەکاندا لە شێوەی (قردی)دا هاتووە(٧٣)، بێگومان شێوە یۆنانیەکەی ئەم ناوە (کەردوخۆی KARDUKHOI) بووە و پاشگری (oi) لە یۆنانیدا نیشانەی کۆکردنەوەیە، بەلاّم "خ، خی" نیشانەی بۆ دۆخێکی تایبەتی ڕستە لە زمانی خەلدی "ئۆرارتی" کە ئەبێت زمانی کاردۆخیەکان پەیوەندیەکی پێوە هەبێت ئەوەش لە بەر ئەوەی ناوچەکانیان کەوتۆتە دەوروبەری مەڵبەندی دەوڵەتی ئۆرارتیەوە کە پایتەختەکەی "توشبا" بوو. بەمجۆرە (کردو) ناوی (کردا) نەبێت هیچی تر نییە کە لە نووسینە مێخیەکان پادشا "شوسین" ٢٠٣٦–٢٠٢٨پ.ز چوارەم پادشای نەوەی ئوری سێیەم ٢١١١–٢٠٠٣پ.ز لە گەڵ ناوی "سو"دا هاتووە، چونکە هەردوو ناوچەکە کەوتوونەتە باشووری دەریاچەی "وان"ەوە. وا دیارە مێژووی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەشێکە لە مێژووی گشتی کوردستان، و سەرەڕای ملکەچ نەبوونی ئەمان لە ڕووی سەربازییەوە بۆ هیچ هێزێك کە بە وڵاتەکەیاندا گوزەری کردبێت، وەك چۆن خودی ئێگزەینەفون گەواهی ئەوە دەدات، بەلاّم بێگومان چەند ئیمپراتۆریەتێك لە ڕووی ڕامیاری و شارستانییەوە ئەو ناوچانەی لە خۆ دەگرت وەك هەردوو

ئیمپراتۆریەتی میتانی و ئۆرارتی، ئەنجا میدی و ئەخمینی. بۆیە مێژووی کاردۆخییەکان بە بەشێك لە مێژووی ئەم ئیمپراتۆریەتانە دادەنرێت و، واشدەرناکەوێت کە رۆڵێکی تایبەت و سەربەخۆیان بینیبێت لەم بوارانەدا.

کۆمەڵگای کاردۆخی کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی سەقامگیر بوو، تاکەکانی لەو گوندە شاخاویانە دەژیان کە خانووەکانی لە بەرد و قوڕ و دار دروستکرابوون. وەك چۆن لە هەندێ لە گوندە کوردیەکانی ئێستادا لەو ناوچانەیەهەیە بەلاّم بە گوێرەی وتەی ئێکزەینەفۆن لە رووی بنیادەوە لەو شێوە بنیادەی لە ئەرمینیادا هەبوو باشتر بوو(٧٤). لە لایەکی دیکەوە یۆنانیەکان هەندێ خورادنیان لە کۆمەڵە ماڵێکی فراواندا دۆزیەوە، هەروەها برێکی زۆریان لەو شەرابە دۆزیەوە کە لە ناو گومەزێکی سەرگەچیندا عەمار کرابوو، کە بەڵگەیە لە سەر گرنگیدانی کارۆدخیەکان بە چاندنی ترێ.(٧٥)

لە ماوەی حەوت رۆژدا ئێکزەینەفون و سەربازە یۆنانیەکان بە ولاّتی کاردۆخیەکاندا گوزەریان کردووە و ئەوانیش دلێرانە بەرگریان لە گوند و کێڵگەکانیان کردووە، ئەمەش ئەبێتە بەڵگەیەك بۆ بوونی لە مێژینەی ئەوان لەو ناوچانەدا بە پێچەوانەی هۆزە دەشتەکییەکانەوە کە بەرگری لە خاك ناکات، بەڵکو لە خودی هۆزەکان. وادیارە دانیشتوانی ولاّتی کردۆ لە ژێر سەرکردایەتی یەکێك لە گەورەکانیان یەکیانگرتووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەربازە یۆنانیەکان ئەگینا چۆن هەمووان پێکهاتن لە چۆڵکردنی گشت ئەو گوندانەی کە یۆنانیەکان وەك رێگەی گەڕانەوە گرتیانەبەر؟ ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ جۆرێك لە رێکخستنی رامیاری لای ئەوان. ئەم بارەش بە شێوەیەکی روونتر لە سەدەی پێنجەمی زاینیدا دەردەکەوێت کاتێك قەشەی مەسیحی "مشیحازخا" بۆمان باس دەکات کە مێژووی هەولێری نووسیوەتەوە لە سەر

ئـەو هەڵمەتـەی سـەربازە فەرسـیەکان و شانشـینی (حـدیب)ی هاوپـەیمان لـە ناوەراستی سەدەی دووەمی زاینی پێی هەسـتان دژ بـە پیاوەکـانی راپـەڕین لـە وڵاتـی قـردو (کـردو)ی شـاخاوی کـە نـاوبراو "کیـزۆ KIZO) سـەرکردایەتی دەکـردن. مشـیحازخا ئەشـلێ "کاردۆخیـەکان هێرشـەکانیان بەرامبـەر ئـەم سوپایانە ڕاگرت لە بەر ئەوەی لە لایەن نەتەوە بەربەریـەکانی دیکـەوە دوچـاری هێرشێکی چاوەڕوان نەکراوبوو هەوڵیاندا شارەکانیان کاول بکەن و بیسـوتێنن و تالآنی بکەن و ژنەکانیان بەدیل بگرن.(٧٦)

لە باکووری میزۆپۆتامیادا ململانێ لە نێوان فەرس و رۆمانـدا بـەردەوامبوو و هەر لە سەدەی دووەمی پ.ز لـە ململانێـی نێـوان هـەردوو هێزەکـە ئەسـتێرەی بـەختی پادشـای ئەرمـەنی تیکرانـی گـەورە دەرکـەوت، سـەرباری بەشـداریی میسراداتی پادشای بونتس لەم ململانێیەدا. تیکـران تـوانی زۆربـەی ناوچـەکانی باکووری کوردسـتان داگـیر بکـات، و بێگومـان دەسـتی گـرت بـە سـەر ناوچـەی کاردۆخیەکاندا.(٧٧)

ئەم بارودۆخەی لە نێوان سەدەی سێیەم و حەوتـەمی زاینیـدا بـەردەوامبوو، و لـەو ئـەو ناوچـانەو هـەروەها شـاری ئامێـدیش "دیاربـەکری ئێسـتا" خـاڵی ململانێی نێوان رۆژهەلآت و رۆژئاوای پێکدەهێنا.

لە گەڵ دەرکەوتنی ئیسلامیشـدا ئـەم ململانێیـە لـەو ناوچـانەدا سروشـتێکی نوێی وەرگرت. یەکێتیە هۆزگەریە کوردیەکان سەرلەنوێ خـۆی لـە چوارچێوەی میرنشـینە ئیسـلامیە کوردیەکانـدا رێکخسـتەوە لـە هەریـەك لـە ئازەربایجـان و میافارقین و قەفقەزیادا (هـەردوو ناوچـەی جنـزە و ئـانی)و بەرامبـەر بێزەنتـە و هاوپـەیمانانی بوەسـتێت کـە دەوڵـەتی ئەرمـەن و جۆرجیـەکان و هێـزە مەسیحیەکانی دیکەن لەوێ، شەددادیە کوردەکانیش رۆڵێکی بەرچـاویان هـەبوو

لەو شەڕانەی کە لەم ناوچانەدا ڕویدا(٧٨)، لە سەدەی دەیەمیشدا ناوچەی (کردو) لە سەردەمی پاشا داودی دووەم سەر بە دەسەلأتی جیۆرجی بوو، کەچی روزەکیە کوردەکان توانیان "کوردوکیەکان" لە چنگی جیۆرجیەکان رزگار بکەن. ناوچەی کردو (قردو) لە سەردەمی ئیسلامیدا یەکێك بوو لەو دەڤەرە کوردیانەی کە ڕاپەڕینی ناوخۆی تێدا ڕویدا، ابن العبری باس لەوە دەکات "کە کورد دوای ئەوەی لە سەردەستی عەرەبەکان کران بە موسڵمان لێیان جیابوونەوە چونکە پادشایەکیان تێدا دەرکەوت خۆی بە مەهدی چاوەڕوانکراوە، ئەنجا مەسیح و روحی قودس دەزانی هەروەها لە شاخی قرداوایە (کردو) خەڵك و سەربازی لە دەوری خۆی کۆکردەوە کە فەرمانڕەوایی مەئمون لە بەردەمیدا هاتە هەژاندن بۆیە (الحسن)ی فەرماندەی سوپاکەی نارد بۆ شەڕکردنی. ...هتد" و ئەشڵێت "لە سەردەمی خەلیفە موعتەسەم دا ٨٤٢ز کوردەکان لە ولآتی قردودا یاحی بوو" ئەشتوانرێت بارودۆخی ئەم ناوچە کوردیە بزانرێت کە لە سەردەمی ئیسلامیدا بە دوورگەی ئیبن عمر ناوبراوە ئەوەش لە کتێبی (الكامل في التاريخ) ی (ابن الاثير) و مێژوو نووسە ئیسلامیەکانی دیکەوە.

لە سەردەمی میدی و ئەخمینیشدا لە قسەکانی ئیگزەینەفوندا شتێکی ئەوتۆ دەرنەکەوتووە کە هێمای ئاینی زەرادەشتی پێوە دیاربێت یان بوونی پەرستگایەکی ئاگر لە ولآتی "کردو"دا بەڵام زمانی کاردۆخی پێدەچێ ناوخۆیی بووبێ (لەوانەش یەکێك بێت لە دیالێکتێکە خەلدیەکان) کەچی وەك زمانەکانی دیکەی کوردستان بە ڕەگەزە هندی- ئۆروپیەکان کاریگەر بوون لە هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زایندا، لە دانیشتوانەکەی لە دەسپێکی سەردەمی ئیسلامیدا بە کورد دەژمێردران و بە زمانی کوردی دەدوان.

# بەشی دووەم

## گۆرانکارییە زمانەوانی و شارستانییەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زاین لە چیاکانی زاگرۆس و کوردستاندا

کنەو پشکنینە شوێنەواریەکان و لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان و ئەوەی پشت راستکردەوە کە ئەو هۆزە دەشتەکییە کۆچەریە جەنگاوەرییانەی کە بەرەو باشوور بەلای رۆژئاوای ئاسایدا کۆچیان کردووە و بە کۆمەڵ دیالێکتێکی نزیك لە یەکیان بە کارهێناوە لە گەڵ زمانی هندی و یۆنانیدا پەیوەندییەکی بەهێزیان هەبووە، کە ئەمرۆ بە کۆ زمانەکانی هیندۆ–ئەورووپی ناسراوە، گوایە لە بنەچەدا لە دەشتەکانی نێوان دەریاچەی "ئارال" و رووباری "دانوب" لە باشووری روسیای ئێستادا دەژیان(١). دەسپێکی ئەو کۆچەش لە کۆتاییەکانی هەزارەی سێیەمی زایندا بوو، و ئەم هۆزانەش بوونەتە دووبەشەوە، هەر بەشێك لایەکی تایبەتی گرتۆتەوە و بەر لە کاتی کۆچەکەدا ئەوەش بە پێی ئەو باردۆخە جوگرافییەی کە رووی ئەو کۆچە دیاری کردووە و بە تایبەتی دەریای قەزوین و رەش. بۆیە هەندێکیان رۆژئاوای دەریای رەشیان وەك رێگەیەك گردۆتەبەر کە چونەتە ناو نیمچە دوورگەی بەلقان و لە گەڵ دانیشتوانی ناوچەکانی هەردوو شارستانێتی کریت و میکینی لە ولاتی یۆنانیدا تێکەڵ بوون.

ئەنجا بەشێك لەوان لە گەرووی دەردەنیل پەڕینەوە و چوونە ناو ئاسیای بچووك و لە ڕێگەی ڕێرەوە قەفقازیەکانی ڕۆژئاوای دەریای رەشەوە تێکەڵ بە شارستانێتە خۆجییەکان بوون و ئەنجا تیایدا بڵاوبوونەوە و کۆچیان لێوەکرد بە هەمان شێوە بەرەو شاخەکانی کوردستان و زاگرۆس و تێکەڵی خەڵکە ناوخۆیەکانی ئەم وڵاتانە بوون و بوون بە نوێنەری ئەو چینە ئەرستۆکراتیەی کە زمانەکەیان سەپاند بەسەر زمانە ناوخۆیەکاندا، دوای ئەوەی کە هەستا بە پێکهێنانی چەند یەکەیەك کە سەرکردەی هۆزەکان و ریشسپیەکان بەڕێوەیان دەبرد لە جیاتی ئەو پەیوەندیە هۆزگەریانەی تاکەکانی ئەم هۆزەیان بە یەکەوە دەبەست لەو کاتەی لە زێدی رەسەنی خۆیاندا وەك کۆچەرییەك دەردەکەوتن. لە ناوەراستەکانی ئەنادۆڵدا لە دەرئەنجامی ئەم بارودۆخەدا لە هەزارەی دووەمی زاینیدا دەوڵەتی حسی وەدەرکەوت. هەر لەو قۆناغەدا لە وڵاتی خوریەکاندا دەوڵەتی میتانی دروست بوو، سەرباری بڵاوبوونەوەی ئەو رەگەزانە لە نێوان کاشیەکان و سەرکردایەتیکردنی ئەوان لە دامەزراندنی دەوڵەتی کاردونیاش لە وڵاتی بابلدا. ئەم بارەش لەو بارە دەچێ کە لە وڵاتی یۆنان و هەروەها هیندیش رویدا لە لایەن هەمان رەگەزەوە ئەمانە لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیشدا هێشتا ڕواڵەتی رەسەنی هاوبەشیان لامابوو ئەوەش لە ناوە ناسراوەکان و پێکهاتەی زمانەوانی یان سامانی زاراوەیی و لە سیستەمی کۆمەڵایەتی دەرکەوتووە یان لە ناوی هەندێك لە خواوەندەکان و چەمکە ئاینییەکان.

لە ناوچەکانی ئاسیای بچووکدا، و بە تایبەتی لە لەودیوی شاخەکانی تۆرۆس و لە کیلیکا کە رەگەزی هیدی ئەورووپی رۆژئاوایی لێ نیشتەجێیە بۆمان دەردەکەوێت کە زمانی باو لەوێ هیندی ئەورووپی بووە.

بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەبینین کە باکووری میزۆپۆتامیا و ولاتی بابلی ئەوکات هەردوکیان بەو رەفتارەی هیندیە رۆژهەلاتیە کاریگەر بوون کە میتانییەکانی پێ جیادەکرایەوە لە گەلانی تر و ئاراستەی کۆچەکانیان بەرە و رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك روونکردەوە.

لە ناوەراستەکانی هەزارەی دووەمی پێش زایندا بە تایبەت لە نیوەی دووەمیدا، دەولەتی میتانی ناوناوبانگێکی جیهانی هەبوو لەوەی کە مەلبەندێکی جێگیری سەرکردایەتی بوو لە باکووری میزۆپۆتامیادا نزیکەی یەك سەدە بە سەرکردایەتی کردنی خەلکانێك کە لە رەچەلەکدا نامۆبوون بۆ دانیشتوانەکەی، و لە گەلّ هاونەژادانی لە هۆزە هیندیە- ئورۆپییەکاندا کۆچیان کردووە بۆ ئێرە، و زمانی فەرمی ئەو دەولەتەش لقێك بووە لە هەمان ئەو زمانەی کەچەند دەقێکی لە کتێبە کۆنە ئاینیە هیندیەکاندا بینراوە کە لە رەچەلەکدا میتانیەکان و خاوەنی ئەو زمانانە دەخاتە پالّ یەك یەکێتی هۆزگەریەوە، بەلاّم کاتی جیابوونەوەیان بە تەواوی روون و ئاشکرا نیە، بە پێی زۆربەی گریمانەکانیش گوایە پێش هەزارەی دووەمی پێش زاین روویداوە لە سەردەمێکدا کە هێشتا شێوە نووسینێکی ناسراویان نەزانیوە.(٢)

لە لایەکی دیکەوە ئەو زمانەی کە لە دەولەتی میتانیدا باوبوو هەرچەندە بنچینە هیندیە ئەورووپیەکەی مابووەوە، بەلاّم پێدەچێ زۆر وشەی ناوخۆی لە زمانێکی ناوخۆی وەرگرتبێ کە بە خوری ناسراوە، چونکە ئەمەی دواییان زمانێکی پیرۆزی دانیشتوانی باکووری دۆلّی رافیدەین بوو تا ماویەك و هەندێك شوێنەواری ماوەتەوە لە چەند تابلۆیەکدا کە بە نووسینی مێخی نوسوراون بە تایبەت لە هەردوو شوێنی نوزی و ماری هەتاوەکو لە ئۆنماریت **(راس شمرة)** ی ئێستاشدا. ئەم تابلۆیانە لە ناو بابەتە یاسایی و بازرگانیەکاندا زۆر ناوی

ناسراوی دانیشتوانە ناوخۆیەکانی تیا هاتووە، کە بەڵگەن بۆ ئەوەی زمانە ناوخۆییەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زایندا دەستی بە کەسایەتی و گەلە وشەکانیەوە گرتووە شان بە شانی زمانی باوی چینە ئەرستۆکراتیەکانی هیندیە ئەورووپیەکان چ لە ناوچە خوریەکاندا یان گۆتی و لۆلبیەکانادا یان کاشیەکان وەك چۆن بینیمان.

ئەو تابلۆیانەی لە هەردوو شوێنی (ئورکیش و نامار) دۆزراونەتەوە تیشکی خستۆتەسەر زۆر لایەنی زمانێکی جیاواز کە بەکارهێنراوە بە تایبەتی لە ناوچەی (ئەرابخا) وەك چۆن هاوشێوەکانی لە حتوشا (بوغازی کوی ئێستا) پایتەختی حیسیەکان دەرکەوتن. بە هەرحاڵ ئەم زمانە چەند دیالێکتێکی هەبوو کە دەنگەکان لە شێوەیەکەوە دەگۆڕیە سەر شێوەیەکی دیکە، بۆ نموونە پیتی (ر) (R) دەگۆڕی بۆ (ل) (L) لە ناوە خۆریەکاندا و لە ناو بەڵگەنامەکانی نوزیدا (ئەموری) بووەتە شێوازی (ئەمولی) لە زاراوەی (شار ئەمولی) و (کلت ئەمولی)دا ئەنجا (کیلشۆ) هەڵگەڕاوە بۆ (کیرشۆ) و ناوی مێینەی (وۆلویا Wu luoia) گۆردراوەتەوە سەر شێوەی وورویا و وشەکانی دیکەی هاوشێوە. بەلاّم هەندێ جار ناوەکان بە پیتی (ش) کۆتایی دەهات چ لە ناوچەکانی خوری یان گۆتی یان لۆبی وەك (کاریش، بوراشی، کیراش یان باراهش) وشەی (شینی senni) خوری کە بە مانای (برا) دێت لە پاڵ ناوی پادشاکانی ئورکیش و ناماردا بەکارهاتووە وەك (ئەریسینی و بوهی- شینی و ئاکی-ب- تارشینی)(٣) و لە پاڵ پاشگری (خی)دا کە هەتاوەکو سەردەمی ئێگزەنەیفون لە ناوی (کردو-خی)دا بەکارهاتووە، ئەوا خورییەکان پاشگری (تی-ti)یان بەکاردەهێنا، بەهەمانشێوە لە ناوچەکانی گۆتی و لۆلۆییدا

بەدیدەکران لەوانە ناوی لێکدراوی (لۆلۆ- با- تی) واتە زێدی لۆلۆ و ناوە هاوشێوەکانی دیکەی وەك (سنکیبۆ- تو/تی) یان (کیلامبا-تی) هی تریش.(٤)

لە لایەکی ترەوە پەیوەندی روحی لە نێوان ئەم هەرێمانە لە چیاکانی زاگرۆس و کوردستان بوو بە هۆی دەرکەوتنی هەندێ شێوازی لێکدراو بە فرمانێکی خوری لە گەڵ ناوی خواوەندە کاسی و ناکاسی وەك (ئەریخ- خارپا HARPA ARIH)، هەروەها (تونی- ماشهو) کە لە فەرمانێکی خوری و ناوێکی کاسی پێکهاتووە کە مانای (پادشا) دەگەیەنێت، ئەو ناوە خوریانەش کە بە ناوی خواوەند (تیشۆب) کۆتایی دێت بە میتانی دەژمێردرێت و دواتریش ناوی هیندی ئۆروپی پەتی لەو وڵاتە دەرکەوت.(٥)

ئەتوانرێت لە پاڵ زمانە هیندیە ئەوروپییە باوەکانی ئەو ناوچانەی باسکران هەندێ وشەو ناو لەم زمانە ناوخۆیە کۆنانە پۆلێن بکرێن و لە یەك جیابکرێنەوە، لە تواناشدا هەیە لە ئێستادا هەندێکی لە چوراچێوەی زمانی کوردیدا دیاریبکرێت. بێگومان ناوی شوێنەواری خوری (شوششارە) بە شێوەی (شمشارە) ماوەتەوە، هەروەها (توبزە)ی خۆری پێی دەوترێت (تۆبزاوا) بە هەمانشێوەی ناوی روباری (بالخ) ناوەکانی دیکەی ناوچە کوردییەکان. بەڵام وشەکمانی شێوەی هێنان (AKAP)، سەر گەورە (ALLAI) خواوەند (ENIS-ENNA) پادشا (IWRI, ERWI) شاخ (PAPNE) دڵ (TISNE) چەسپاو، جێگیر (YRHA) فەرمی (HALZUHLU) بە تەواوەتی نەماون لە زمانی دانیشتوانە ناوخۆییەکانی کوردستاندا کە بە زمانی خوری دەدوان.(٦)

کەچی چەند وشەیەکی میتانی هەن لە شێوەی AIKA- یەك، PANSA- پێنج، NAWA- نۆ، کە لە زمانی کوردیدا وەك خۆی

ماوتـــەوە، ســـەرباری بلاْوبوونـــەوەی نـــاوە هندیـــە ئۆروپییـــەکانی بـــاکووری میزۆپۆتامیا وەك (ئەرتا- مننا- ئەننا- ئاما- ئەوا- شورا- شو- مالا- شو- مالیا) و هی تر، لەو ناوانەی کە تایبەتن بە پادشـاکانی وەك (بارسـا- شـاتار- ساو- شاتت، ساو- شاتتار) لە بەڵگەنامەکانی حتوشا (بوغازی کوی)شدا نـاوی خواوەندی بە ناو بانگ (ششورا) لای هۆزە هندیـە ئۆروپییـەکان درەکـەوتووە، ئەم نـاوە لـە تابلۆکـانی نـوزی بـە شـێوەی (سـورا) هـاتووە کـە هندییـەکان لـە ئەلیفدادا بە شێوەی (ئەسـوارا) تۆماریـان کـردووە، هـەروەها لـە ئاڤێسـتادا لای ئێرانییەکان بە ناوی (ئاهوار)(٧)، هاتووە بەلاْم لای کاسیەکان بە هەمان شـێوە هاتووە کە لای نوزی بینراوە کەئـەویش (سـوریاش)ە، و چـووەتە سـەر نـاوێکی ناسراوی لێکدراو وەکـو شـاکاراکتی سـوریاش بـە هەمانشـێوەی نـازی بوریـاش، نازی بوکاش، ئولامبوریاش، نازیماروتاش کە ناوی کاشی — ئاری لێکدراون.

ئاینی خـوریش لـە رەچـەڵەکدا وەك رێکخسـتنی ئەنـدامی فـرە چـینی هەمـە ڕەگـەز بەدرێـژایی سـەدان سـاڵ دروسـتبووە. بـەناوبانگترین خواوەنـدی خـوری پـەتی کومـاربی (بـاوکی خواوەنـدەکان) بـوو، خیبـا (ژنـی تیشـوب) و کـوری، کوشـوخ، شاوشـکا (خواوەنـدی خۆشەویسـتی وشـەڕ= عەشـتاری خوریـەکان) ئـەنجا شـیری و شـوالا، تیشـوب (خواوەنـدی کـەش)، تـیلا، تـیروی، کوسـوە، سیمکی و هی تر.

ئاینی خوری لە رێگەی هەردوو کەسایەتیە سەرەکییەکەی لە کۆڕی لاهوتیـدا کە خواوەندی کەش تیشوب و خیبای ژنیشـی، بـە تـەنها کاریـان نەکردۆتەسـەر وڵاتـی سـوبارتۆ، بـەڵکو بـە شـێوەیەکی تایبـەت لـەو تێپـەڕیکردووە و کـاری کردووەتە سەر حیسیەکانیش بە تایبەت لە دواکاتی ژیـانی شانشـینی حیسـیدا. بـەلاْم کاریگـەری بـاوکی خواوەنـدە خوریـەکان کومـاربی بێگومـان درێـژتر و

قوڵتربوو. و لای خوریەکان باوەڕێك هەبووە کە لە دوای مردن ژیانەوە هەیە بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو دارەی کە دەکەوێتە نێوان دوو گیانداریماڵییەوە بابەتی باسی مۆرە خۆریەکان بووە. ئەم دارەش داری ژیانە کە پەیوەستە بە بازنەیی باڵداری خورەوە، لە پاڵ ئەم سومبولانەشدا ئەو مۆرانە بەتاڵ نییە لە دیمەنەکانی ململانێی نێوان شێرو گاو هەندێ گیانلەبەر ئەنجا هەندێ دیمەنی ئاهەنانگەکان کە هێمای شایی خواوەندە پیرۆزەکانە.

لە هەزارەی دووەمی پێش زاین و لەو کاتەوەی کە هیندە — ئارییەکان ببوون بە چینی دەسەڵاتداری سەردانیشتوانی ناوخۆیی لە چیای زاگرۆس و کوردستاندا، سەرباری ئەو خواوەندەی کە لە وڵاتی رەسەنی خۆیاندا هێنابوویان خاوەندە ناوخۆییەکانشیان هێشتەوە. بۆیە پەرستگا میتانیەکان ژمارەیەکی زۆری تێدا بوو کە دەرەنجامی داگیرکاریەکان کەڵەکەی کردبوو، چونکە لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا دەستکاری خواوەند و کەشی پەرستنیان نەدەکرد لە ترسی تووڕەبوونیدا رێزیان لێدەگرت. لە پەراوێزی ئەو پەیماننامە جیایانەی خرابوونە ژێر چاودێرییەوە ناوی ئەم خاوەندانەی تیاهاتووە، زۆری خاوەندەکانیش هێمان بۆ ئەو فرە رەگەزییەی کە شانشینی میتانی لێی پێکهاتبوو وەك (تیشوب و خیبای هاوسەری) هەروەها خاوەندەکانی وڵاتی دراوسێ و شاخەکانی زاگرۆس و هەردوو رووباری دیجلەو و فورات و ئاسمان و زەوی و باو هەور بە هەمان باری دەوڵەتی حسی.

ئەوکاتەی رەگەزە هیندیە ئۆروپیەکان توانیان سەرکردایەتی و رێبەرایەتی رامیاری نەتەوەکانی باکووری میزۆپۆتامیا بکەن لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پ.ز، ناوی چەند خواوەندێکی دیکە چووە سەر ناوەکانی تر، وەك ڤارونا واندرا و ناساتیا و میسرا، ئەم خواوەندانەش لە تایبەتمەندیەکانی ئاینی

زەردەشتیدا وەك خۆی باسنەكراوە، ناوی ناساتیا لە شێوەی (ئاهیتا nahetya) لە گەڵ ئەندرا لە ئاڤێستادا وەك دێوەزمەو جنۆكەو شەیتان هاتووە (ناویندودات ٤٣، ١٩، ٩). بەڵام (فارونا) لە جیهانی ئێراندا نەناسراوە. و دەڵێن ناساتیاهو (ناون- هیتیا) كە مانای (نارەوانیە) دەبەخشێت و لە راستیدا لای گۆتەكان Goth خواوەند (ناسیان NASJAN)ە. و ڤارونا خاوەندی سیستەمە، بەڵام بێگومان ئەندرا خواوەندی بارانە(٨)، هەروەها میسرا كە پەرستنی لای رۆمانیش درێژەی هەبووە خواوەندی هەتاوی پرشنگدارە و پارێزەری سیستەم یان بەرپرس یان چاودێریەتی، مەبەستیشمان لە سیستەم جیهانی سروشت و سستەمی جیهانی رێو رەسمە قوربانیەكانە، ئەم رێورەسمانەش پێی دەوترێت (ریتا RITA) كە یەكێكە لەو بیرۆكانە زۆرە درێژخایەنەی ئاینیە رۆژهەڵاتیە كۆنەكان لە سەر هەڵدەچێنرێت، هەرچی رێكوپێكە، رێكخراوە لە خۆ دەگرێت، هەركەسە وەك خۆی كار دەكات، ئەوەش لە خۆ دەگرێ كە (سروشتی) و (گونجاوە لە گەڵ سروشتدا)، ئەو وشەش بە تێپەربوونی كات گۆڕاوە بۆ شێوەی (ئەرتا ARTA) بە مانای بێگەرد، تێبینی كراوە كە پەیوەستە بە چەند ناوێكی ناسراوی میتانیەوە وەك (ئەرتا - ئاما) و بە چەند ناوێكی كوردستانیەوە (ئەرتا-سەری) كە یەكێكە لە سەرانی ناوخۆی زێی بچوك لەسەردەمی ئاشووریدا، (ئەرتا- بان) لەسەردەمی فەرسی، ئەنجا ئەردەشێر لە سەردەمی ساسانی كە لە (ئەرتا- خشێر)ەوە هاتووە لە سەردەمی ئەخمینیدا دەسەڵاتداربووە.

زۆر پێدەچێ كە خواوەند (میترا) خواوەندی رەوشت بووبێ لێپرسراوی سیستەمە بە فراوانترین ماناكانی، بەڵام بە زۆری پێگەی خۆی لە دەستداوە و وایلێهات كە تەنها بەسەر گەردەلوول و شەپۆلەكانی دەریادا زاڵبێت، لە

راستیشدا خواوەند (ئەندرا) لە هەندێ ناوچەی رۆژئاوای ئاسیادا بوو بە خواوەندی کاریگەر و مەزن، هەروەها خولیای مەی و ژن بوو و مەزنترینی نێو خواوەندەکان بوو. بەمشێوەیە ڤالینا دەست بەرداری ئەندرابوو(٩). میتراش بوو بە هاوڕێی ڤارونا و پەیوەندییەکی پتەو دەبەستن و، هەردووکیشیان خواوەندی پەیمان بون، لەوانەشە لە راستیدا ئاسمان و خۆر بن. ئەنجا لای میتانیەکان و حیسیەکان رۆڵی خواوەندی شەڕی بینیوە و تێبینی کراوە کە سەرۆکی خواوەندەکان بووە لە ئەلفیدای هیندیدا (کتێبی پیرۆزی دێرین لە هند). لەم کتێبەدا لە بارەیەوە هاتووە کە بەسەر کۆمەڵێك لە دوژمنانیدا لە دێو و مرۆڤ سەرکەوتووە هەروەها خۆری بەزاندووە و ئەو مێردەزمەی کوشتووە کە با وەرزییەکانی لە (فرترا) راگرتووە. چەکی خواوەند ئیندرا بریسکەو هەورە گرمە بووە لە ئاسماندا، و لە بەر کارە پیرۆزەکانی ئۆکسیدی (سوما)ی خواردۆتەوە و بەهێزبووە، لە هەڤالانی (مارتوس) ئەو خواوەندەیە کە لای کاشیەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زایین ناوی لە شێوەی (ماروتاش) هاتووە، بەلام لای هندیەکان وێنای کۆمەڵە لاوێك دەکات کە بەڕێدەکەن و باران دروستدەکەن.(١٠)

لە لایەکی ترەوە ناوی خواوەندە میترا لەو پەیماننامانە هاتووە کە لە نێوان حیسیەکان و میتانیەکان گێرراوە وەك خواوەندی سوێن، بۆیە لە تێکستەکانی ئەلفیدای هندیدا ناوەکەی بە مانای (راستگۆ و پەیمان) هاتووە، چونکە بە هەمانشێوە لای هندیەکان وەك خواوەندی پەیماننامەو رێکەوتننەکان ناوبانگی دەرکردووە. لە هەمانکاتیشدا خواوەندی خۆر بووە کە هەڵدێ و رووناك دوەکاتەوە و سەیری هەموو شت دەکات، هەروەها دانیشتوانی میزۆپۆتامیا و یۆنان و رۆمانیش باوەڕیان پێهێناوە، ئەنجا بوو بە خواوەندی پادشاکان و

چینە ئەرستۆکراتیەکان و خواوەندی پەیمانی نێوان ئەوان و جەنگاوەرەکان ئەنجا خوداوەند شەڕو پاشان خواوەندی دادپەروەری، لە گرنترین جەژنەکانی لەو دوایانەدا (میسراکان یان میهرەکان = مهیرەجان) بەم بۆنەیەشەوە گایەکی بۆ دەکرا بە قوربانی، بەلاّم سەیر ئەوەیە کە پادشا ئەخمانیەکان سەرەڕای ئەوەی بەشێك لەو ڕێو ڕەسمە زەردەشتیەکانی پێکدەهێنا کەچی پەرستنی ئەم خواوەندەیان پشتگوێ خستبوو، دیارە هۆکارەکەی ئامانجی ڕامیاری بووە وەك چۆن لە تابلۆکانی ئەم خواوەندەدا دەبینرێت زۆرجار گایەکی لە هەردوو شاخیەوە گرتووە کە هەوڵدەدات بیکوژێ، پشت بەستن بە ئەفسانە رۆژئاواییەکان گوایە خوێنی ئەم گایە گەنمی ڕواندوە و سەربڕینی گاکە لە لایەن (میترا)وە بوو بەو خشڵەی کە میسریەکان پەرستگایەکیان بۆ نەخشاند. پەیکەرە گەورەکانیش ئاژەڵی هێمابەخش دەوری دابوون و گەنجیش بە مەشخەڵەوە ئابلّووقەی داون. میترا لە دیدی خەڵکدا خواوەندێکی تکاکەر بووە، رووحەکان ئیدانە دەکات و رێگەچارەیەك نییە بۆ چاکبوونەوەیان لە گوناە، وە ڕێگەی پاکبوونەوە لە لایەکەوە بە کردنی کەشەکان دەکرێت و هەروەها بە مانەوە لە سەر ڕاستگۆیی و ئازایەتی، ئەو کەسانەش کە دەچنە پەنهانی ئەم ئاینەی کە لە رێو رەسمەکانی لە پەرستگایەکی تاریکی ژێر زەویدا بە شکۆداری و قەشەنگییەکەوە دەکرێت ناخی مرۆڤ دەووروژێنێت، بە حەوت قۆناغدا تێدەپەڕن هەر قۆناغەو نازناوێکی مەزنی هەیە کە لەوانەیە ئەم نازناوانەش پەیوەست بووبێتن بە حەوت هەسارەکەوە دواتر ئەوەی مەسیحەکانی شلّەژاند و ڕا ڕایکردن ئەو لێکچوونەی نێوان ئاینەکەیان و ئاینی میترائی بوو، ئەوەش کە میترا نەك هەر باپیرە گەورە و لەو زەیوانانەی نەبووە کە خۆیان بۆ زەیوانیێ تەرخانکردووە، بگرە لەو پاکیزانەشی نەبوو کە لە ژیان دابڕاون بۆ پەرستن،

بەڵکو یاساکانی باسی لە گەڕانەوەی دەکرد بۆ ژیان و، ئەو گەڕانەوەش لە پێشییەوە دەردەسەری و گرانی روودەدات. هەڵئەسێتەوە و نەمرییان پێدەبەخشێت لە دواجاردا بە هاتنی ئاگرێك لە ئاسمانەوە خراپە لەناودەبرێت و رووداوەکە لە کڵێسە کۆتایی دێت بە میهرکردنێکی گەورە بە میترا، ئەوەش بە لەئامێزگرتنی جەژنە گەورەکەی کە دەکەوێتە ٢٥ی دیسەمبەرەوە (کانوونی دووەم) کە رۆژی لە دایکبوونی ئەو خۆرەیە کە نابەزێت، و ئەیکاتە جەژنی لە دایکبوونی یەسوعی مەسیح.(١١)

ئەوەی لێرەدا شایەنی باسە ئەوەیە کە پەرستنی ئەم خواوەندە لە سەردەمی هللیندا لە پارچە زەویەکی فراوانی جیهانی کۆندا هەبووە، سەرباری هیند، پەرستنی لە رۆژئاوای ئێران و باکوور و میزۆپۆتامیا و ئاسیای بچوکیشدا باو بووە. بە تایبەتی لە لایەن چینی ئەرستۆکراتی و فەرمانڕەوایی هەرێمەکانی هەردوو ئمپراتۆریەتی پرس و رۆمان و بۆنتس و پوما کینی هەروەها چەتەکانی کیلیکیاش پەرستوویانە.

بۆیە لەم سەردەمەدا زۆرێك لە ئیمپراتۆریەت و پاشاکانی لای فرس و ئەرمەون و بوونتس و بەو ناوە لێکدراونەوە ناونراون کە لە گەڵ ناوی ئەم خواوەندە پێکدێت وەکو میترا- دات (بەخششی خواوەند میترا). و لە ساڵی ١٣٦ز، سەدان پەیکەر و وێنەی هەڵکەندراوی ئەم خواوەندە لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا دروستکرابوون، پاشان میترائی لای رۆمان بوو بە ئاینی گوێڕایەڵی پادشاکان، کە ئیمپراتۆرەکان و بە تایبەت کۆمۆدۆس (١٨٠ز- ١٩٢ ن) و سیبتیمیۆس سیفیرۆس (١٩٣ز-٢١١ن) و کاراکلا (٢١١ز-٢١٧ن) پشتگیری دەکرد. لەسەردەمی ساسانیشدا خەڵکەکە وازیان هێنا لە پەرستنی خواوەند (خۆر) کە ناوی خۆریەکانی لێوە داتاشراوە، دەستیان دایە پەرستنی میهرا

(میترا) یـان "(مـیترای یەشـتات ی (کۆن)" کـە خواوەنـدی سـەوزایی و گزنگـی بەیانیـە، کـە بابلییـەکان بـە (شـەمش) ناسـیویانە (١٢) دوا شـێوەی نـاوی ئـەم خاوەندە لە گەڵ ناوە ناسراوەکاندا لە یەکدراوە وەك (میهر– زاتا) کە ئێستا لـە کوردیـدا بـوو بـە (مـیرزا) کـە لـە هەمانکاتـدا بـە مانـای (خوێنـدەوار، نوسـەر) دەبەخشـێت، هـەروەها میهرەبـان، و نـاوی رۆوژی ئاهـەنگی جەژنەکـەی لـە عەرەبیدا وەکو خۆی ماوە (مهرجان) (میهرەکان).

بەمشێوە ناوچەکانی کوردستان لەم قۆناغە مێژوویانـەدا چـووەتە ژێـر بـاری هەموو ئەم دیاردە شارستانییانەی کە هۆزە هیندۆ ئۆروپیەکان هێناویانەو بـیر و هۆشی خۆریەکان و لۆلییەکان و گۆتییەکان و کاشیەکانی پێ موتوربە کردووە. سـەرباری ئـەم دیاردانـەش ئـەوەی میدیـەکان هێنایـان لـە بنـەما زمانـەوانی و ئاینیـەکان و لـە هـەزارەی یەکـەمی پـێش زایـندا و ئـەو پرسـە ئەتنۆگرافیانـە فرسەکان هێنایانە ئەم کۆمەڵگایانەوە بەشێکی سەرەکی لـە کـەلتووری هـزری و زمانـەوانی و میلـی کـورد پێکـدەهێنێت لـەو سـەردەمانەی دەکەوێتـە پـێش دەرکەوتنی ئیسلامەوە.

# دەروازەی سێیەم

## بەشی یەکەم

کوردستان لە هەزارەی یەکەمی پێش زاین

## بەشی دووەم

سکیسیەکان SCYTH (سکوسیەکان)

## بەشی سێیەم

میدیەکان- مادەکان MEDIOI

# بەشی یەکەم

## کوردستان لە هەزارەی یەکەمی پێش زاین

ئـەو کۆڕانکاریـە شارسـتانی و زمانەوانیانـەی، کـە سـەرجەمی ناوچـەکانی ئاسایی بچووك و کوردسـتان و چیاکانی زاگـرۆس لـە هـەزارەی دووەمـی پـێش زاینـدا بەخۆیـەوە بینـی، لـە دوای کۆچـی نەتـەوە هینـدۆ ئۆرووپیـەکان بـۆ ئـەو ناوچانە، بناغەی جۆرەها مەرجی بابەتی چەسپان بۆ سەرهەڵدانی چـەند گـەل و دەوڵـەتێکی خـاوەن سروشـتی نـوێ، کـە بـە کـەلتوور و زمانیـان جیاکـارن لـەو نەتەوانەی دانیشتووی هەمان ناوچەن. لە دەرەنجامی ئەو ململانێی کە لە نێوان ئـەم هێـزە نوێیانـە دەرکـەوت کـە چـینی سـەرکردەی باڵادەسـتی ئـەم وڵاتـەی پێکهێنـاوە، لـە گـەڵ مەڵبەنـدە شارسـتانییەکانی دۆڵـی دوو رووبـاردا هـەروەها دەسـەلاتی میسـر لـە سـوریادا، دەرەنجامەکـەی گۆرانکـاری گـەورە بـوو لـە ئایدۆلۆژیای رامیاری و هزری و ئاینی لەو وڵاتە، دوای ئەوەی دەوڵەتی حسی لـە لوتکەی هێزیدا بوو، دەستی وەردایە کاروباری بابل و سوریاوە، پادشای حسـی مورسلی یەکەم// ئەو بیناکاریانەی تەواو کـرد کـە حـەمورابی لـە بابلـدا دەسـتی پێکردبـوو، دوای ئـەم کـارە گرنگەشـی هـاتنی کاشـیەکان بەسـەرکردایەتی ئـەو رەگەزە – هیندیە– ئۆروپیانە بە هەمانشێوە کە حیسـییەکانیش سـەر بەئـەوان بوون، لە کاتێکدا میتانیەکان "کە لە هەمان رەگەزن "زاڵبوون بە سەر بـاکووری دۆڵی دوو رووبـاردا بـۆ زیـاتر لـە سـەدەیەك وەك کۆسـپێکی گـەورە لـە بـەردەم

هەستانەوەی ئاشوور و هاوپەیمانێکی بەهێزی فیرعەونەکانی میسر لە ئاسیادا و، ئەگەر سەرەتای هەزارەی یەکەم پ.ز قۆناغی بووژانەوەی گەلانی دۆڵی دوو رووبار و تەواوکاریی ئاوێتە بوونی زمانەوانی و شارستانی نێوان دانیشتوانی سەرەوەی وڵات بێت، لە گەڵ کۆچبەرە هیندیە-ئۆروپیەکاندا، ئەوا چەند کۆچێکی نویێ هەبووە و، لە لایەن هەمان رەگەزەوە کە بەرەو هەمان مەڵبەند دزەیان دەکرد، ئیمپراتۆریەتی ئاشوریش بە بەردەوامی ئەو کۆچکردنانەی رووە و خۆرئاوا دەگۆڕیێ یان بەرە و رووی چیاکانی زاگرۆس یان بەرەو ئاسیای بچووك، هەروەها چیا کوردیەکان و بە گشتی زاگرۆس ئاراستەی هۆزە کۆچبەرەکانی دیاریدەکرد کە ئەتوانرێت بە سیێ گروپ پۆلێن بکرێن، ئەوانەش میدی و سکیسی و کیمیرین، بەڵام فارسەکان روویانکردە باشووری چیاکانی زاگرۆس و لەو هەرێمە جێگیربوون کە بە فارس ناسرا، و دەکەوێتە بەشی باشووری رۆژئاوای ئێرانەوە.(١)

لە لایەکی تریشەوە دەریاچەی ورمیێ ئاراستەی ئەو میدیانەی دیاریکرد کە لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا هاتبوون(٢)، هەروەها دەوڵەتی (ماننا) بەربەستێکی سیاسی بەهێزی لە بەردەمیاندا دروستکرد پێش تێکەڵبوونیان بە دەوڵەتی ئاشووری. ئەمەو هەروەها شانشینی ئۆرارتی کۆسپێك بوو لە بەردەم پێشڕەوی ئەسکیسی و کیمیریەکان لە ناوچەکانی باکوور و رۆژئاواوە بەرە و مەڵبەندە شارستانێتێکان، بە هەمانشێوە و بە درێژایی رۆژگار هاوپەیمانی سەربازی و رامیاری لە نێوان ئەم هێزە ململانیێ کارانە لە باکووری میزۆپۆتامیا و رۆژئاوای ئێران دروست بوو، بۆیە رێگەیەکی تر نەبوو بۆ هاوپەیمانێتی ئاشووریەکان لە گەڵ ئەو مانیانەی کە پێش ئاشوور لە لایەن میدیەکانەوە هەرەشەیان لیێ دەکرا، هەروەها لە گەڵ ئەو سکیسیانەی بە باکووردا لە بەردەم مەترسی

ئۆرارتیـدا هاوکاریـان دەکـردن(٣). بۆیـه ڕێگەیـەکی تـر نـەبوو لـه بـەردەم میدیەکاندا تەنها ئەوە نەبێ لەو کلدیانە بابل نزیك ببنەوە کە لەو سەردەمەدا لـە لایەن ئاشوریەکانەوە هەرەشەیان لێدەکرا(٤). لـه گەرمـەی ئـەم ململانـێ و ئـەم بـاره ئـاڵۆزەدا دەوڵـەتی ئۆرارتـۆ لـه بـەردەم سکیسـیەکان و کیمیریەکانـدا هەرەسی هێنا و هێـزە هاوبەشـەکانی ئاشـووری–مـاننی لـه سـاڵ ٦١٦ پ.ز لـه شەڕی (کالینا) له سەر ڕووباری فورات له بـەردەم بابلییـەکانادا شکسـتی هێنـا، بەوەش به تەواوەتی کۆتـایی بـه هێـزە مانیـەکان هێنـا(٥) لـه مێـژوودا و هـۆزە میدیەکانیش له دوای ئەم ڕووداوە دەستپێکی چوونە نـاو ولاتـی ماننـا بـوون و لەوێدا کۆتاییـان بـه فـەرمانڕەوایی مـاننی هێنـا، دواتـر ڕووبـەڕووی هاوپـەیمانی ئاشووری سکیسی بوویەوە له باکووری میزۆپۆتامیا. جـا سکیسـیەکان کێن؟ و میدیەکان کێن؟ ئەمەش له دوو بەشی داهاتوودا دەردەکەوێت.

## بەشی دووەم

# سکیسیەکان SCYTH (سکوسیەکان)

یەکەم هەواڵی سکیسیەکان لە ئیلیازەی هۆمیرۆسدا هاتووە، وەك خەڵکانێك ئەسپ بەخێو دەکەن و شیری ماین دەخۆنەوە، بەلاّم لە ئۆدیسادا ناوی کیمیریەکان هاتووە، کە گروپێکی ترن لە دانیشتوانی باکووری دەریای رەش، وە نیمچە دوورگەی (قرم) یان کردۆتە ولاّتی خۆیان هەروەها بلاّوبوونەتەوە لە دەشتەکانی ئۆکۆانیای ئێستادا و ئەوان خزمی سکیسیەکانن. بەلاّم مێژوو نووسی یۆنانی هیرۆدۆتس (نزیکەی ٤٨٤–٤٢٥ پ.ز) لە ناو باسکردنی شەری فارسی– گریکی لە کتێبەکەیدا ئامـاژەی بۆ کردووە و بە وردی سنوور و جوگرافیای ولاّتەکەیانی دەستنیشان کردووە، ئنجا باسی لە رەچەڵەك و نەریت و پەیوەندییە بازرگانیەکانیان دەکات لە گەڵ ئەو دراوسێیانەی کە ملکەچی سیستەمە شاهانە سکیسیەکان بوون لە ولاّتی سکیسیا، لە باکووری دەریای رەشدا. هەروەها چەند هەواڵێکی خۆشی تۆمار کردووە لە سەر هەڵمەتەکانی دارای ئەخمینی لە ساڵەکانی (٥١٥–٥١٤پ.ز) بۆ سەر سکیسیەکان لە ماڵەکانیاندا، دوای ئەوەی کە رۆڵیان لە ئاسیای بچووك و ولاّتی میدیا دەخاتەڕوو، بگرە لە سەر سنووری میسریشدا لە نزیکەی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاین.(١)

لـه پـاڵ هیرۆدۆتسیشـدا (سـوکیدیدا کیلانیـك)(٢)ی هاوچـەرخی، باسـی سکیسیەکانی تۆمار کردووە، بەڵام ئەوەی لە وڵاتەکانی هیپۆکراتدا (٤٦٠-٣٧٧ پ.ز)(٣) دەبینین پێی ئەچێ بیرۆکەیەکی روونمان بـداتێ لەسـەر وڵاتـی ئـەوان. ئەم باسەی لەسەر هەواڵ و ئاو و سروشت وایکرد کە وڵاتـی سـکیس و سـەرمات (ئەوانیش جۆرێکی تری سکیسن) ببنە بەڵگەیەك بۆ بۆچوونەکانی سـەبارەت بـە بنیـاتی سورشـتی مـرۆڤ و رۆڵـی کـەش و هـەوا لـە بنیاتنانیـدا. و پێـی وایـە کـە سروشـت و ژیـانی شـوانکاری گونجـاو لـە گـەڵ ئـەو سروشـتەی سکیسـدا هەردووکیان نهێنـی جوانی ئـەو وڵاتەیانـە کـە لـە کـەناری لای راسـتی رووبـاری تانایس (ئەلدونی ئێستا) دیاریکردووە. ئنجا باسی ئەوان لە کتێبـەکانی ترازێـدیا ئەسـنیەکانی ئەسـخیل و سـوفوکل و ئۆریبـددا هـاتووە(٤)، ئەسـخیل (٥٢٥-٤٥٦پ.ز) دەڵێت: ئەوان لـە دەوروبـەری ئـەو دەریایـەدا دەژیـان کـە ئێسـتا لـە باشووری رووسا بە (ئـەزوف) ناسـراوە، ئنجـا بـە رێـرەوی قەفقازیـەکان دەڵێـت (رێگـای سـکیس) کاتێـك رووبـانکردە ناوچـەکانی رۆژهـەڵاتی ئاسـیای بچـووك (کوردستان)، سوفوکلیش (٤٩٦-٤٦٠پ.ز) بەشێك لـە ئەفسـانەی خسـتۆتە نـاو ترازێدیای باسکردنی سـکیس و نەتـەوەکانی دیکـەوە، هـەروەها ئۆریبـد (٤٨٠-٤٠٦پ.ز) وەکو ئەفسانە باسی کردوون، کەچی هەندێ هـەواڵی دڵ تـەنگ هەیـە لـە ترازێـدیای (ڕیـس RES) کـە ئامـاژەیـە بـۆ ئـەو دوژمنایەتیـەی لـە نێـوان تەراقیەکان (دانیشتوانی کۆنی بۆلگاریا) و سکیسدا هەبووە.

ئنجا لە ئەسینا هەندێ ئاماژە هەیـە بـۆ بوونیـان لـە ئەسـینا وەك هـەڵگرانی تیر و کەوان لە سەردەی پێنجەمی پێش زایـن کـە ئەرسـتۆڤان (٤٥٠-٣٨٥پ.ز) لە کۆمیدیای (هوموکا)دا تۆمـاریکردووە(٦). کەسـانی دیکـەش هـەن کـە باسـی

کردوون وەکو بیندار (٥٢٣-٤٤٢پ.ز) وە سوکیدیدی (٤٧٠-٤٠٠پ.ز) وە ئـەفور (٤٠٥-٣٣٠پ.ز) وە کەسانی دیکەش کە نووسەرە کۆنەکانی یۆنانن.

سکیـسـیا (Scythia) لـە بنەرەتـدا ئـەو ناوچـانەی گرتۆتـەوە کـە هـۆزە سکیسیـەکانی سـەرگەورەیی کـردووە لـە دەشـتایی نێـوان کـەرباس و رووبـاری ئەلـدۆن لـە بـاکووری دەریـای رەشـدا. هەنـدێجار ئـەم چـەمکە فراوانبـووە وەك جـوگرافی ناسـی یۆنـانی سـترابۆ پێمـان دەڵـێ، کـە (هۆبرۆجـە) کـە ناوچـە دەشتاییەکانی باکووری بولگاریای ئێستایە، لە چوارچێوەی ئەو وڵاتـەدا و نـاوی لێناوە (سکیسـای خـواروو)، بـەوەش ناولێنانەکـە هۆزەکـانی سـەرمات و چـەند هـۆزێکی دیکـەش دەگرێتـەوە. زۆرجـاری یۆنانیـەکان مەبەسـتیان لـە نـاوی (SKUTHES) ئـەو هۆزانـەی - بەربـەری- کـە لـە بـاکوور و بـاکووری رۆژهـەڵاتی دەریـای رەشـەوە هـاتوون. هـەر لـە سـەدەی دووەمـی زاینیـەوە مێژوونووسانی رۆمان لە جیاتی سکیس باسیان لە سـەرمات کـردووە، دیـۆدۆری سقلی باسی ئەوانی بەستۆتەوە بە گـەرووی بسـفۆرەوە(٧)، مەبەسـتی لـەوەش ئـەو گەروەیـە کـە بـە (کیرجـین) نـاوی دەرکـردووە لـە ناوچـەی کیمیریـەکان (دوورگـەی قـرم). نـەوەك ئـەوەی بـە بسـفۆری تـەراقی ناسـراوە لـە نزیـك ئەستەمبووڵی ئێستا(٨)، سترابۆش زانیاریەکانی لـەو سەرچـاوانەوە وەرگرتـووە کـە لـەس ەردەمـی مـیترادات پادشـای بنـتس و یولیـوس قەیسـەر باسـی لێـوە کردوون. سەرباری ئەوەی کە ئەم جوگرافی ناسە (لە دەوری ٦٣پ.ز -٢٣ز) بە دەگمەن ناوی سکیسی دەهێنێت بەڵام سەبارەت بە ئەوان پشتی بە هەریەك لـە هیرۆدۆتس و ئەفۆر بەستووە.

هـەروەها لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی دووەمـی پـێش زاینـدا فـەرمانڕەوای سکیسی بە باڵا دەستی مابوویەوە لە باکووری (قرم) و ئەو دەشتانەی دەکەونە

دەوروبەری نزمایەکانی رووباری (دەنیبەر)ەوە. وە سنوری ولاّتی سکیس بە کاری ململانێی نێوانیان و نێوان نەتەوەکانی دیکە تووشی داشکان بوو. دواتریش هۆزەکانی (یەزکیت و روخسەلآن)ی سکیسی لە دوای جیابوونەوەیان لە هۆزەکانی دیکە لە دەشتەکانی ئۆکرانیای نزیك (ئەزوف) نیشتەجێ بوون(٩)، هەر لەم ماوەیەوە وشەی (سکیسا SCYTHIA) وایلێهات وردە وردە لە نووسینەکاندا ون ببێت، لە بەر نیشتەجێ بوونی هۆزەکانی دیکە لەو ناوچانەدا.

لە رۆژئاوای ئاسیاشدا، سکیسیەکان لە رۆژهەلاّتی ئاسیای بچووکدا دەرکەوتن ئەمە لە دوای ئەوەی هەلّهاتن بەرەو ئەم ناوچانە لە رێرەوی قەفقازییەکانەوە (رۆژهەلاّتی دەریای رەش) لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زایندا(١٠). ئنجا لە ناوچە کوردییەکانی ئێستادا لە هەریەك لە تورکیا و ئێراندا بلاّوبوونەوە لە دوای ئەوەی کە سەرگبۆنی دووەمی ئاشووری سالّی ٧١٤پ.ز دەولّەتی ئۆراراتی و هاوپەمانەکانی لە ناو برد و سکیسیەکان هەندێ زەوی زاری خۆیانیان دەستکەوتەوە. دواتر هەرەشەیان لە خودی ئاشوور کرد، هەربۆیە ئەسەرحەدون (٦٨١-٦٦٩پ.ز) دەوروبەری سالّی ٦٧٩پ.ز پێمان رادەگەیەنێت لەو کاتەی لە جەنگدابوون لە گەلّ کیمریەکاندا (کیمیرای) کە : (تیوشبی کیمیری، کە نیشتمانی دوورە، کوشتم و سەربازەکانیم تێکشکاند... هتد) ئەوانیش لە گەلّ سکیسیەکاندا هاوپەیمان بوون، (ئەسەرحەدون) ئەو کاتەی کچەکەی لە (بارتاتۆ)ی سەرکردەی سکیسی (ئەشکور) مارە کرد ئەو هاوپەیمانیەی تێکشکاند و لە دەرنجامی ئەوەدا لە گەلّ هۆزەکانیدا رووەو باکوور کۆچیکرد. ولاّتی ئۆرارتۆ لە بەر هەلّمەتاکانیان

لە لایەن ئەوانەوە کەوتنە بارودۆخێکی خراپەوە کە لە کۆتاییدا بووە هۆی خۆ کوشتنی پادشای ئۆراراتی (رووساسی یەکەم).(١١)

لە راستیدا یەکەم هەواڵ لە بارەی بوونیان لە ئاسیای بچووك لە تۆماری ئاشوور پاڵی دووەمدا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی پێش زایندا تۆمار کراوە و ناولێنانەکانیش لە شێوەی (ئەشکەوازی و کیمیرایی) هاتوون. بەڵام ئاشوور پانیپاڵ (٦٦٨–٦٢٨پ.ز) بەردەوام بوو لە ململانێی دژ بە کیمیریەکان لە رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکدا، بەهەمانشێوە پادشای لیدی (کیکیس)یش لە ساڵی ٦٦٠پ.ز، ڕاوە دووی دەکردن لە دەروبەری ئەنادۆڵ و دوو سەرکردەی کیمیری بە دیلگیراوی وەك دیاری نارد بۆ ئاشوور پانیپاڵ بەڵام لە دوایدا لە بەردەم ئەم هۆزانەدا چۆکی دادا.(١٢)

ئاشوورپانیپاڵ پێمان رادەگکەینێت کە ئەم هۆزانە گەشتونەتە سنووری میسر و فیرعەون (بەسامیتی یەکەم) (٦٧٠–٦١٦پ.ز) شەڕی لە گەڵ کردوون و لە دوای کوشتنی (کیکیس)ی پادشای لیدی چوونە لیدیاوە و ئەم وڵاتەش لە زەمەنی (ئەردیسی کوڕی کیکیسدا (٦٥٠–٦٢٥پ.ز) لە ژێر گوشاری کیمیریەکاندا بوو، هەتا وەکو بۆ جاری دووەمیش دەستیان گرت بە سەر (سارد)ی پایتەختدا، لە گەڵ ئەوەشدا دووچاری شەڕێکی سەخت بوونەوە لە قیلیقیا لە باشووری ئەنادۆڵ لە گەڵ ئاشوورییەکاندا (١٣).

لە دوای مردنی پرۆتۆتیا (لە تێکستە ئاشووریەکاندا– بارتاتۆ –یە) ماددی (مادیس)ی کوڕی سەرکردایەتی یەکێتی هۆزگەریی سکیسی کردەوە(١٤). بە قسەی هیرۆدۆتس ئەوان چوونەتە خاکی میدیەکانەوە و چەند ناوچەیەکیان گرتووە و بۆ ماوەی ٢٨ ساڵ فەرمانڕەواییان کردووە. ئەو تۆمارە بابلییانەش کە لە نێوان ٦١٦–٦٠٩پ.ز نووسراوە ئاماژە بەم رووداوانە دەکەن.

ئەمە سەربارى ئەوەى بە هەمانشێوە ئاشوور پانیپاڵ لە سەرچوونى كیمیریەكان بۆ میدیا تۆمارى كردووە، پاش ئەوە لەسەدەى حەوتەمى پێش زایندا بە سەركردایەتى (لیكرام) چوونە ناو ئاسیاوە، بە پێى وتەكانى (سترابۆ) و (بولوتارخ)، لە ئەنجامى هەستانیان بە وێرانكردنى شارەكانى (ئەیۆنیا) و (لیدیا)، ئنجا روویان كردە (كەبدوكیا) و (فینیقیا) لەوێش ئاشوور پانیپاڵ لە ناوى بردن.

وادیارە سكیسیەكان، لە پاش ئەوەى رێڕەوەكانى قەفقازیایان بەزاند روویانكردە دووبەرە. گروپى یەكەم دووركەوتنەوە بەرە و باشوور بۆ دەروبەرى دەریاچەى ورمێ و تێكەڵ بە خەڵكى میدى بوون لە كوردستانى ئێران (ناوچەى موكریان). گروپى دووەمیش بەردەوام بوون لە كۆچەكەیان بەرەو ئەنادۆڵ و كۆتایى هێنا بە دەسەلاتى فریجیدا كە بەهۆیەوە پادشا (میراس) خۆى كوشت. ولاتى لیدیاش بەختى باشتر نەبوو، وەك باسدەكرێ پادشاكەیان كوشتووە (١٥). ئەوەى ئێستا گرنگ بێت بۆ ئێمە لە سكیسیەكان، گروپى یەكەمە. ئەوان گەشتنە سەر رێگاى هەمەدان (ئەكباتاناى پایتەختى میدیەكان) و لە سنوورى ولاتى ماننادا جێگیربوون لەوێش شانیشینێكیان دامەزراند هەموو ناوچە كوردى و ئازربایجانیەكانى ئێستاى ئێرانى لە خۆگرتەوە، مەڵبەندەكەیان لە باشوورى دەریاچەى ورمێ داناو مانیەكانیش دانیان نا بە دەسەلاتەكەیاندا و چەند شارێكى وەك (سەقز)یان بنیاتنا، ئەم ناوەش لە ناوى خۆیان (سكس) ەوە داتاشراوە، بێگومان درێژەیانداوە بە كۆچەكەیان تا هەولێر و كەركوك و دەسەلاتى خۆیان بەسەر ئەم ناوچانەدا سەپاندووە لە هەردووسەدەى دووەم و یەكەمى پێش زاین پاش ئەوەى میدیەكان لە سەردەمى (كەى ئەخسار)دا بلاوەى پێكردن.

له كۆتايی سه‌ده‌ی حه‌وته‌می پێش زاین ره‌وشی سیاسی له‌ ولاتی ماننادا زۆر ئالۆزبوو كه‌ له‌ دواییدا بوو به‌ هۆكاری ڕودانی ڕاپه‌ڕینی جه‌ماوه‌ری دژ ه ده‌سه‌لاتی ئۆلیگارشی فه‌رمانڕه‌وا، له‌ ده‌ره‌نجامه‌كانیشی كوژرانی پادشایماننی (ئه‌خشیری)بوو، به‌وه‌ش سكیس له‌ سه‌ر حسابی مانیه‌كان ده‌سه‌لاتی خۆی فراوانكرد، ناوچه‌ كوردیه‌كانی مه‌هاباد و سه‌قز و زێویێ هه‌روه‌ها له‌ ناوچه‌ نزیكه‌كانی سنووری عێراق-ئێران، له‌ ڕووی شنۆ - نه‌غه‌ده‌وه‌، دوای نه‌مانی فه‌رمانڕه‌وای مانی له‌ ماوه‌ی ٢٨ سالدا- وه‌ك باسكرا- سكیس بناغه‌یه‌كی بۆ رژێمی سیاسی خۆی دامه‌رزاند، ئه‌م فه‌رمانڕه‌وایه‌ش به‌ ده‌ستی میدیه‌كان كۆتایی هات. له‌م باره‌یه‌وه‌ هیرۆدۆتس ده‌لێ: (سكیسیه‌كان بۆ ماوه‌ی بیست و هه‌شت سال فه‌رمانڕه‌وای ئاسیایان كردووه‌ و تێیدا زه‌بر و زه‌نگ و چه‌وسانه‌وه‌یان ده‌رخستووه‌ تاوه‌كو وێرانكاری هه‌موو شوێنێكی گرته‌وه‌، سه‌رباری سه‌رانه‌ و باجێكی زۆریان سه‌پانده‌ سه‌ر چه‌ند نه‌ته‌وه‌یه‌كدا به‌ ویستی خۆیان بڕه‌كه‌یان دیاریده‌كرد. له‌ هه‌موو كون و قوژبنێكی ولاتدا خراپه‌یان نایه‌وه‌ و، هه‌رچه‌ند توانبێتیان تاك به‌ تاكیان تالان كرد.

له‌و كاته‌ش كه‌ كیاكساریس (كه‌ی ئه‌خسار) گه‌مارۆی شاری نه‌ینه‌وای دا سوپای (عه‌رموم)ی له‌ سكیسه‌كان له‌و كاته‌دا به‌ سه‌ركردایه‌تی پادشا مادیس (مادی) هێرشی كردنه‌ سه‌ر و خه‌ریكی ڕاودوونانی ئه‌و كیمیریانه‌بوو كه‌ له‌ ئۆروپاوه‌ هاتبون، به‌م چه‌شنه‌ش سكیسه‌كان چوونه‌ ناو خاكی میدیه‌كانه‌وه‌.(١٦)

له‌ دوایدا كه‌ جام پڕبوو، كیاكساریس و میدیه‌كان زۆرترین ژماره‌یان له‌وان داوه‌ت كرد بۆ خوانێك كه‌ بڕێكی زۆر مه‌ییان پێشكه‌ش كردن تاوه‌كو مه‌ست بوون. ئه‌و كات ده‌ستیان دایه‌ كوشتنیان تاقیانیان بڕییه‌وه‌. دوای ئه‌وه‌

میدیەکان ئیمپراتۆریەتیەکەی خۆیان دەستکەوتەوە بە تەواوی سنوورەکانی پێشووترەوە.(١٧)

لەم دواییانەدا هەندێ لەو شوێنەوارانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ سکیس لەو رێڕەوانەی کە لە قەفقازیا دەیانگرتەبەر، ئنجا لەو ناوچە کوردیانەی لەڕووی سیاسیەوە تیایدا جێگیر بوون لەو ناوچانەدا پیشەسازی برۆنزی و سەرە رم و تیر و چەند ئامرازێکی دیکە بینراون کە هەمووی سیمای سکیسی هەڵگرتووە کە جیاوازە لە دانیشتوانی خۆجێی ئەم ناوچە، گرنگترین ئەم شوێنانەش کە ئەم کارانەی تیا دۆزراونەتەوە یەکێکبوو لە کەلاوەی قەڵای ئۆرارتیەکان لە (کرمیر بلوور) نزیك یەریڤان پایتەختی ئەرمینیای سۆڤێتی.

لێرەدا کنەو پشکنینەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە شارەکان لەو کاتەوەی سکیس دەستی بەسەردا گرتووە کاول کراوە و سوتێنراوە. تیرەکانیشیان بە دیواری بینا رووخاوەکانی شارەکەوە هەر ماوە(١٨). بەڵام ئاسەواری هونەرەکەیان لەو کارانەدا بەجێهێشتووە کە لە سەقز و زێوێ و شارەکانی دیکەی کوردستانی ئێران دۆزراونەتەوە. کریشمانیش ئەڵێ دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە چینەکانی پاشا سکیسیەکان(١٩). پێیشی وایە کە هی (پارتاتوا یان مادیسی کوڕێتی) کەنزەکانی سەقزیش پیشەسازی ئاڵتونی سێ شێوەی هونەری لە خۆ دەگرت. یەکەم: شێوازەکەی کاریگەری هونەری ئاشووری لە سەرە، دووەمیش: سکیسیەکی پەتییە، سێیەمیشیان: تێکەڵە ئەمەو سەرباری هونەری مانی باوی ئەوێ.

زمانی سکیسیش زۆرێك لە تایبەتمەندییە زمانەوانیە ئارییەکانی بە بنچە هیندۆ ئۆروپی تیا دەردەکەوت، و زۆربەی ناوی پاشاکانیان بە بنچینە ئێرانییە وەکو (ئەریا بیف، ئۆکتاماساد، سیتافێرت) و هی تریش، وادیارە لە گەڵ

سەرماتەکاندا بە یەك زمان دواون، چونکە هیرۆدۆتس ئاماژە بە ئێرانی بوونی زمانی سەرماتی دەکات. زۆربەی نووسەرە کۆنەکان نزیکی زمانی میدی لە زمانی ئەم هۆزانەیان دووپات کردۆتەوە و، لە ئاسیای بچووکەوە وشەی فریجیان تێکەڵ بووە، ئنجا تێکەڵ بووە بە زمانە خۆجێیەتیەکانی باکوری میزۆپۆتامیای بە بنچینە نا ئێرانی. لە راستیدا بنچینەی زمانی سکیس دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکەی لە ناوچەی خوارزم و بەهۆی کۆچی شوانکاری سکیسیەکانەوە بەرەو رۆژئاوا گوازراوەتەوە ئەوانیش بەشێکن لەوانەی لە ئاسیادا بە ساکا (سکس) ناسرابوون، هەروەها لە ناوچەکانی دەروبەری رووباری دێبەر و دینیستەر، لە پاڵ شوانکاری و ئاژەڵداری و کشتوکاڵی سنووردااردا کە چینە کۆمەلآیەتیەکانی کیمیریەکانی هێنایە کایەوە، چینێکی ئەرستۆکراتی جەنگی شەڕکەریان تیادەرکەوت، لە دەروبەری قرم و ئەرز رۆمیش سیستەمی کۆمەلآیەتی پشتی دەبەست بە ئینتیمای هۆزایەتی دەشتەکی و، لە کاتی ڕەوکردنی ئەوان بە رەو ئاسیای بچووك لە ژێر سەرکردایەتی (تیشۆپ و لیکدام)دا کۆمەڵگاکەیان لەم دۆخەدابوو.

کاتێکیش بنەماکانی سەقامگیری تەواوکاربوو بۆ هەندێ لە کیمیریەکان لە زێدی راستەقینەی خۆیاندا، لە گەڵیدا بنەماکانی سەقامگیری بۆ هەندێ لە هۆزە کۆچەرییەکانی سکیسیش دەرکەوت، لە نێوان کۆمەڵگای کشتوکاڵی و دەشتەکی بە درێژایی ئەو هێڵەی لە دەشتەکانی سکیسیاوە درێژ دەبێتەوە لە نێوان هەردوو کشوەری ئۆروپا و ئاسیا لە باکووری هەردوو دەریای ڕەش و قەزویندا ململانێکە سەختر بوو، سکیسیەکانی باکووری دەریای رەش توانیان خۆیان لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا رێکخەنەوە کەبوو بووە بەربەستێك لە بەردەم فراوانخوازی شارە یۆنانیەکان لەو ناوچانەدا، لە رووی زمانەوانی و

شارستانییەوە کاریان کردۆتەسەر تەراقیەکانی نیمچە دوورگەی بەلقان و دانیشتوانی حەوزی رووباری دانووب، هەروەها کاریان کردەسەر باکووری مولدافیا و رۆژئاوای ئۆکرانیا.

نووسەرە یۆنانیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە دەسەلآت لەم کۆمەلگادا (بە تایبەت لای هۆزەکانی سەرمات) بە دەستی ژنان بووە شان بەشانی پیاوان جەنگاون و مێردیان نەکردووە. بە کەسێك تاوەکو لە شەردا دوژمنێکی نەکوشتایە. بۆیە هیرۆدۆتس ئەڵێ (سەرمات- سورمات)، لە دەرەنجامی هاوسەرگیری سکیسیەکانە لە گەڵ ئەو ژنە ئەمەزۆنیانە پەیدابوون، کە لە رێگەی رووباری ئەلدونەوە بە بەلەم هێنابوویانیان، ئەنجا لە رێگەی رووباری فیرمۆدۆتاوە بەرە و ئاسیای بچووك کۆچیان کردووە، پێشی وایە لە سەدەی سێیەم و دووەمی پێش زایندا دەسەلآتی دایکایەتی لای ئەوان ونبووە.

لە قسەکانی هیرۆدۆتسدا رووداوی خۆش هاتووە لە سەر نەریتەکانی سکیس بەهۆزە جیاوازەکانیەوە، ئەلێت: ( لە کاتی گەڕانەوەی سکیسیەکان بۆ ولآتی خۆیان لە دوای دابڕانێکی دوور و درێژ، کارێکی سەخت چاوەڕوانی دەکردن، کە سووکتربوو لە خەباتیان دژ بە میدیەکان. کە سوپایەکیان هاتەپێش ژمارەی کەم نەبوو و، ئامادەشن بۆ رێگریکردنیان لە هاتنە ناوەوەیان، کاتێك ژنە سکیسیەکان زانیان کات بەسەر دەچێت مێردەکانیشیان ناگەڕێنەوە، مێردیان بە کۆیلەکانی خۆیان کرد).(٢١)

کاتێك ئەم کۆیلانەو ژنە سکوکسیەکان (سکیسییەکان) منداڵیان بوو منداڵەکانیش گەورەبوون و بوون بە پیاو، دۆخی پەروەردەکردنی خۆیانیان زانی، سووربوون بۆبەرەنگاربوونەوەی ئەو سوپایەی لە میدیاوە گەرابوونەوە. هیرۆدۆتس لەسەر ئەم رووداوانە درێژە بە باسەکەی دەدات، ئەنجا بۆ هەندێ

دابونەریتی تایبەتییان دەچێت و دەڵێت: ((سەربازی سکیسی خوێنی یەکەم پیاو دەخواتەوە کە لە جەنگدا ئەیبەزێنێ. و ژمارەی ئەوانەی دەیانکوژێ هەرچەند بن، ئەوا سەری هەموویان دەبڕێ و دەیبات بۆ پادشا. بەوەش مافی ئەبێت لە دەستکەوتەکاندا، ئەگەر هیچ سەرێکیشی نەهێنا هەموو مافێك لە دەستدەدا) پاش ئەوەی لە باسی ئەو دابونەریتە دڕندەیانە دەبێتەوە، هیرۆدۆتس ئاماژە بە چارەسەری نەخۆشییەکانی لای ئەوان دەکات. باس لەوە دەکات کە پاشای سکیسی نەخۆش ئەنێری بە دوای سییان لە بەناوبانگترین جادوگەری ئەو سەردەمەدا پێشبینی ئەوە دەکەن کەوا کەسێك بە درۆ سوێندی بە پلەو پایەی پادشا خواردووە، لەو کاتەدا ئەو کەسە دەستگیر دەکات کە جادوگەرەکان بە سوێندنی درۆ تۆمەتباریان کردووە و، دەیهێننە بەردەم پادشا. پیاوەکەش نکۆڵی لە تۆمەتەکە دەکات وسکالای خۆی دەردەبڕێ، لەو کاتەدا پادشا ئەنێرێ بە دوای شەش جادوگەری دیکەدا، ئەگەر زانیان پیاوەکە تاوانبارە سەری دەبڕێ و سەر و ماڵی دابەشدەکرا، ئەگەر زۆرینەشیان بێ تاوانیان کرد، ئەوانەی پێشتر ئیدانەیان کردبوو لە سێدارە دەدرێن. ڕێگەیەکی تایبەتشیان هەبوو بۆ لەناوبردنیان ئەوەش بە بەستنی دەستیان لە پشتەوە و فرێدانیان بۆ ناو ئاگرێك لە ناو گالیسکەیەك کە گای هەژیو رایدەکێشا.(٢٢)

هۆزە شوانکاریە سکیسییەکان لە کۆچی بەردەوامدا بوون، و زۆربەی کات رۆژگاری بەهار و پایز لە چۆڵی دەشتەکاندا دەیانبردە سەر. لە زستان و هاوینیشدا لە سەر رووبارەکان جێگیر دەبوون، و بە ئەسپ هاتووچۆیان دەکرد و ژنانیش لە ناو ئەو گالیسکانە بوون کە بە پێستی ئاژەڵەکان دایانپۆشیبوو، هەر گالیسکەیەك بۆ خێزانێکی سکیسی بە ماڵێکی تایبەت دادەنرا، وە دیاردەی فرە ژنی لە ناویاندا باو بوو.(٢٢)

جلوبەرگی سکیسی وەك لەو شوێنەوار و نیگارانەیاندا دەردەکەوێت کە دۆزراونەتەوە بە تایبەتی لە ناوچەی "کوڵ ئۆبا KUL OBA" کە پێکدێت لە قاتێکی کەمەردار لە سەر شواڵێك کە شۆڕبۆتەوە سەر پێڵاوێکی نەرم، و سەریشیان بە کڵاوقووچێك دادەپۆشی سیمای ئەم شێوازە لای فرسەکان لە ئێران دەبینن هەروەها بەشێکی زۆری لە جلوبەرگە میللیەکاندا ماوەتەوە، ژنانیش کەوایەکی درێژیان دەپۆشی لە گەڵ شتێك جەستەیانی داپۆشیایە. لە سەر جلەکانیان بە شێوەیەکی گشتی نیگاری دەفری ئاڵتونیان دەدرو. زینی ئەسپەکانیشیان لە پارچەیەك بوو بە هەمانشێوە رازێنرابوویەوە.

سکیسیەکان لە کاتی جەنگدا بەسەر سێ شانشینی بچووکدا دابەشدەبوون، ئەوانیش دابەشدەبوون بۆ چەند گروپێکی بچووك، هەر گروپێك سەرکردەیەك سەرکردایەتی دەکرد، هەموویان دەعوەتی ئەو سەرکردەیان دەکرد کە دوژمنانی سکیسی سەربڕیوە پاشان دەستکەوتەکانیان لە ناوخۆیاندا دابەشدەکرد هەر تاکێکیش هەوڵیئەدا بەڵگەیەك لە بەردەم پادشادا پیشکەش بکات بۆ دەرخستنی رۆڵی خۆی بۆ ئەوەی لە دەستکەوتەکاندا پشکی خۆی بەرکەوی ئەوەش بە دامالینی پیستی دوژمن، لگاوی ئەسپەکەش بەوانە دەڕازینێتەوە کە لە دوژمنان دەستی کەوتووە، ئەنجا کەللەسەری دوژمنەکەی بە دەستی بەرز دەکاتەوە. تاکتیکی سەربازیشیان هۆزگەریی بوو، ئەوەش بە بێزارکردنی دوژمن بوو. کە خۆیان وابیشان بەن گوایە هەڵدین و پاشەکشە دەکەن، ئەنجا بۆی دەگەڕیچتەوە و بە قۆناغ لیی دەدات، و دووبارە لیی دووردەکەویتەوە. چەکەکانیانیش پێکدەهات لە تیر و کەوان و شمشێری بچووك و ڕم و تەور. مەسەلە روحی و ئاینیەکان لای هۆزە سکیسیەکان بنەماکانی پەرستنی دیاردە سروشتییەکان بووە، هیرۆدۆتسیش ناوی کۆمەڵێك لە

خواوەندە سکیسییەکانی هێناوە (تابیتی و بابایۆس و ئابی ژنی و هیتریش) بەلاّم ئەوەی لە پاشماوە روحییەکانیان ماوە پەرستگایەکە بە هەیکەلەکەیەوە لە پالّ هەندیّ پەیکەری تایبەت بە ئەریسی خواوەند. هەندێجاریش سکیسییەکان کۆمەلێ دارو چیلکەیان کۆکردۆتەوە شمشێرێکیان خستۆتەسەر کە دەربڕینە بۆ هێزی خواوەند، ئەنجا دیل و دەستگیرکراوەکان وەکو قوربانی بۆ ئەم خواوەندە پێشکەش دەکرد بە رژانی خوێنیان بە سەر دارو یلکەکەدا لە لایەکی ترەوە سکیسیەکان باوەڕیان بە هەندیّ هیزی سحری هەبوو کە نەخۆشەکانیان پیّ چارەسەر کردووە بە ئەنجامدانی هەندیّ لەو کردارانەی پەیوەندی بەم هێزانەوە هەیە. تاکی سکیسیی لە رۆژی مردنیدا نەئەنێژرا لەبەر ئەوەی تەرمەکەی ئەهێنرا بۆلای ئەو هاوڕێیانەی کە لە بەر ئەو بێدار ئەبوون تاوەکو دوای چل رۆژ ئەنێژرا.

لە کاتی مردنی پادشاشدا گۆڕێکی شێوە چوار گۆشەی قەبارە گەورەی بۆ هەلّئەکەندرا، ئەنجا تەرمەکەیان دەبرد لە پاش هەلّدرینی سکی و دەرهێنانی ناوسکی و پاکردنەوەی، وە پڕکردنی بە تێکەلّەیەك لە گەلاّی سندیانی زیانبەخش، و سنۆبەری نێر و تۆوی مەعدەنۆس پاشان درزەکەیان دەدروویەوە. وە تەرمەکە بە مۆم دادەپۆشا، ئەیانخستە سەر گالیسکەیەك، وە بە ناو هۆزە جیاجیاکاندا دەیانگێڕا. ئەنجا خەلّکەکە دەچوونە سەر گۆڕستانی پاشایان لەویّ تەرمەکەی دەخرایە ئەو گۆڕەی کە بۆی ئامادە کراوە لە سەر تەختەیەك رایاندەکێشا. وە لە زەویشدا لەملاو لای تەرمەکەوە رمیان دەچەقانە. لە گەلّ پادشاشدا یەکێك لە کەنیزەکانی لە دوای خنکاندنی دەیخەنە گۆڕەکەوە، هەروەها مەیگێڕ و ئاشپەز و سایس و خزمەتکاری تایبەت و پەیامبەر، و هەندیّ لە ئەسپ و سەر و مالّە سەرەکییەکانی دیکەی، هەندیّ

له پەرداخە ئاڵۆنیەکانیشی دوای ئەوەش تەپۆلکەیەك لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکرا. بۆیە لە دوای دۆزینەوەی ئەم گۆڕانە ڕێژەی ئاڵتون تیایدا سەیر و واقوڕهێنەر و ئەوەش دووپاتی دەکاتەوە کە پاشاکانی سکیس دەستیان گرتبوو بە سەر داهاتە ئابوورییەکانی زۆرێك لە وڵاتانی پاشماوەکانی دیکە لەم گۆڕانەدا بریتی بوون لە لولێنەی زبر دروستکراو و چەند ئامرازێك لە بەردی سوان و تاوێر و مس و نەخشی زیون، وە دیزاینی ئەکم گۆڕستانە نموونەیەکی تێکدراوی هونەری گریکی بوو لە سەدەکانی ٧-٢ پ.ز، لە پاڵ کاریگەری یۆنانی لەسەر کارەکانی دیکەیان، بەڵام ئەم کارانەیان لە ناوەوە بەربەری بوو لە دەرەوەش یۆنانی بوو. لە ناوەکانی ئەلکسەندەر پۆل و سولوخا لە قەفقازیا هەندێك گۆڕستانی سکیسی دۆزرایەوە، بە تایبەت ئەو گۆڕستانەی ( ملۆکونۆف) ماسراوە و لە ساڵی ١٧٦٠ز دۆزراوەتەوە کە هەندێ لەو کارانەی تێدا بوو کاریگەربوون بە هونەرە ئاشوورییەکان و دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شەشەمی پێش زاین ئەوەش هی ئەو سکیسانەیە کە میدیاکان لە گەڵیاندا بەشەر هاتن و لە کوردستان دەریان کردن.

هونەری پوختی سکیسی تایبەتمەندییەکی ناسراوی هەیە. ئەوەی لە گۆڕستانە سکیسیەکاندا بینراو لە خەنجەر و شمشێری کورتی سێلك کە بە تیژی و زبری جیادەکرێتەوە، خەنجەرەکە بە دووپەت هەڵدەواسرا بۆ ئەوەی سوارەکە سەغڵەت نەکا لە کاتنی جوڵانەوەیدا. ئەمجۆرە خەنجەر و شمشێرانەش لای ئێرانیەکان بەکاردەهات و لە تابلۆکانی پرسی پۆلیشدا بەدیدەکرێت. بەهەمانشێوە تیردانی چەماوەی کورت شێوەیەکی تایبەتی هەبووە. بە گشتی کرۆکی هونەری سکیسی لە وێنەی ئاژەڵەکانی وەك وشتر و ئاسك و ورچ و سەری باڵندەکاندا چەق دەبەستێت کە چەك و پۆشاکی

ئەپسەکانیان پـێ رازانـدبووەوە. لـە هـەر دۆخێکدا بابەتـەکانی نەخشـکاری لـە تێڕوانینــە باوەکــانی لای ئــەوان بــوو ئــەوەش زیــاتر هۆکــاری زۆر لــە نــاو نیگارەکانیاندا ڕاستی بە خەیاڵ تێکەڵ کردبوو. بۆیە لەم کارانـەدا وێنـەی چـەند ئاژەڵێکی خـەیاڵی هـەبوو کەتیایدا بـە شـیوەیەکی گشـتی شـێوازی ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیایی دەردەکـەوێت هەنـدێکیش بـۆ بنچـینەیەکی زۆرکـۆن دەگەڕێتـەوە، بـە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە ژیانی ئەو گەلە سەرەتاییانەی کە پشـتی بـە ڕاوکردنی ئەژەڵ بەستووە لـە دەشـت و دارسـتانەکانی ئەلتەنـدرا. بەڵگـەش بـۆ ئــەوە بــوونی لێکچــوونە لــە نێــوان نۆبــەرەی سکیســـی و ئــەو هونەرانــەی پەیوەندییان هەیە بـە سـەردەمی کانزاییـەوە لـە دەروبـەری نـەرویج بـەڵام ئـەم هونـەرە زۆر کاریگـەر بـوو بـە هونـەری کریکـی لـە باشـووری ڕوسـیا، بـەڵام بـە گەشتنی سەرمات بۆ ئەو ناوچانە هونـەری ئێرانـی تیایانـدا بڵاوبوویـەوە لـە گـەڵ زیادکردنی نەخشکاری و فرەی ڕەنگی و هەمەجۆری ئاژەڵەکان.

پاشان پێگەی هونەری دوولایەنی سکیسی لە گەڵ کۆچەکانیاندا فـراوان بـوو لە کشوەری ئەوڕپادا بڵاوبۆیەوە لە چاخەکانی ناوەراسـتدا، ڕەنگدانەوەشـی لـە سنووری چیندا دەرکەوت لـە ڕێگـەی ئـەو کۆچـەی سکیسـە دەشـتەکییەکان لـە سیبریاوە کردیان شوێنەوارەکەی لە چـەند ماڵێکـدا دەرکـەوت کـە لـە مـەنگۆلیا دۆزرایەوە.

بـە هـەرحاڵ بەشـێك لـە سکیسـیەکان لـە ناوچـەکانی کوردسـتان لـە دوای سەردەمی ئاشووریدا سەرباری لایەنی زمانەوانی نەژادی دانیشـتوانی گاریگـەری کـردە سـەر بڵاوبوونـەوەی هێماکـانی شارسـتانیەتیەکەیان و بـە تایبـەت لایەنـە ئەتنۆگرافیەکـەی، و لــە ســەردەمی فرســیدا قوڵتربوویــەوە ئــەوەش بــەهۆی ئینتیمای فرسەکان بۆ هۆزەکانی (ساکا) ژن خوازی سکیس لە ڕۆژهەڵات.



دووجەنگاوەری میدی لەگەڵ دووسکیسیکدا
بەشەڕ هـاتوون



دوو سواری هۆزەکانی ســاکــا ( سکیس )

## بەشی سێیەم

## میدیەکان- مادەکان MEDIOI

یەکەمین ئاماژەی تایبەت بە میدیەکان لە نووسینەکانی پاشا ئاشووریەکانی سەردەمی سەدەی نۆیەمی پێش زاینیەوە پێمان گەیشتووە، بە تایبەت بە نووسینەکانی پاشای ئاشووری شەمەلنەسەری سییەم ٨٥٨-٨٢٤پ.ز، کە باس لە هەڵمەتە جەنگیەکەی دەکات بۆ سەر ناوچە شاخاوییەکان لە ئیچران و چیاکانی زاگرۆس، لەم هەوالآنەوە باسی هۆزە میدیەکان بە شێوەی (ئامادای AMADAI) هاتووە لە ساڵی ٨٣٦پ.ز کە لە باشووری رۆژهەلآتی دەریاچەی وان نیشتەجێن لە سەر سنووری هەمەدان. (١)



**گروپێك لە دانیشتوانی میدیا - نەخشی چیایەکی ئاشوری**

(بە ڕوانینمان لە باسی دەقە مێخیەکان بۆ وشەی (مادا MADA) کە مانای (خاك، ولآت) دەگەیەنێت بۆمان دەردەکەوێت ناولێنانی ئاشووریەکان بۆ ئەم هۆزانە پشت بەو ناوچەیە دەبەستێت کە تیایدا جێگیربوون هەربۆیە ناو لێنانی میدیەکان لەسەرتادا و، لە سەر ئەم بنەمایە، ناوی نەتەوەییان نانوێنیّ، بەڵکو گەڕانەوە بۆ ئەو ناوچەیەی تێیدا جێگیر بوون، وەکو ناوچەی پارسوا PARSUA کە کەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێوە و دەشێت ناوی (پارس–فارس)ی لێوە داتاشرابێت، ئەمەش شتیکی زۆر ئاساییە چونکە گەلە دێرینەکان بە گشتی لەسەر ناوی ئەو پێگە جوکرافیەیە ناودەنراون کە تێیدا بوون، سەرباری ئەوەش نامۆ نیە ئەگەر وشەی (مادا) کە لەدەقەکانی کۆتایی هەزارەی سییەمی پێش زاییندا دەرکەوتووە، لە نووسینەکانی هەزارەی یەکەمی پیش زایندا بگۆڕێت بۆ ئامادای (AMADAI)، پاشان ببێتە ناوێکی گشتی گروپێك لە یەکێتیە هۆزگەرییە لە یەك نزیکەکان لە رووی رزمان و نەژادەوە. بۆیە لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زاین زۆرجار ناوی (مادا، مادای) بەچەمکی ئەو هۆزانە هاتووە کە دیالێکتێکی ئێرانی لە یەکەوە نزیك بەکاردێنن لە سەدەکانی (٩، ٧) پ.ز، لە دەروبەری رووباری (قیزل–ئۆزن) بەرەو ڕۆژهەلآت تاوەکو (دەشتکافر) هاتوچۆیان کردوە، لەسەر ئەم بنەمایە ئەوانەی لەم دەروبەرەدا لە ناوەکانی دەسەلاتی ئاشوورەکانەوە نزیك بوون بە (مادای داننوتی– میدیە بەهێزەکان) و (مادای ڕوقوتی– میدیە دوورەکان ناسراون) بێگومان ئەو ناولێنانەش لەم ماوەیەدا مۆرکی گروپێکی مرۆیی هاوچەشنی جیاکاری وەرگرت، بەکارهێنانی بە هەمان مەبەست بەردەوام بوو لە سەردەمی ئەخمینیدا کاتێك پاشدا ئەخمینییەکان خۆیان بە پاشاکانی (پارس و مادا) پێکەوە وەسف دەکرد ئەمە سەرباری بەکارهێنانی

هیرۆدۆتس بۆ ناوی میدیەکان (MEDAOA) بە چەمکی نەتەوەیەکی جیاکار.

ئەمەو پاشا (شەمش ئەدد)ی پێنجەم ٨٢٣-٨١١پ.ز و پاشا (ئەدناراری) سێیەم ١٨٠-٣٨٣پ.ز باسی کردوون، هەروەها پاشا (تجلات پلیزەر)ی سێیەم ٧٤٤-٧٢٧پ.ز ئەو پاشایانەش کە دوای ئەو هاتوون باسی کردوون، کە ئاژاو بەجەرگبوون، وە ئەو ناوچەی میدیەکان تیایدا جیگیربوون ئەوشاخانەیە کە لە کەنداوەوە تاوەکو دەریاچەی (وان) درێژدەبێتەوە بە تەنیشتی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و دواتریش کوردستان.

لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی پێش زایینـدا پیاوێکی بەهێز بە ناوی (دایکـو DAIKKU)ەوە سەرکردایەتی میدیەکانی دەکرد، لە مێژووی هیرۆدتسدا بە ناوی (دیۆگیس DIOCES) ەوە هاتووە، مێژوونووسیش ئەمە بە دامەزرێنەری شانشینی میدیەکان دادەنێت. یەکەم کار کە دایکۆ پێی هەستاوە هاوپەیکانی بوو لە گەڵ دەوڵەتی ئۆرارتۆ دژ بە دەوڵەتی ئاشووری هەربۆیە پاشای بەهێز سەرگۆن دووەم ساڵی ٧٢١ -٧٠٥پ.ز چووە سەر تەختی دەوڵەتی ئاشووری، بۆ سەر شانشینی ئۆرارتۆ لەسەردەمی رووساسی پاشایدا و بۆ سەر هاوپەیمانەکانی پاشای میدی دایکو هەڵمەتێکی ئەنجامدا، سەرگۆن توانی ئەم هاوپیەمانیە تێکدا و لە گەڵ ئەوەشدا هەستا بە دوورخستنەوەی دایکۆ و خێزانەکەی بۆ (حومات) لە سوریا، لەوانەشە دواتر گەیەنرابێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی، ئەم پاشایە کە فەرمانڕەوایەتیەکەی لە نزیکەی ٧٠٨ پ.ز دەستی پێکردووە لە هەواڵە ئاشووریەکاندا بە زەبر و زەنگی ناوبانگ بووە، بە چەشنێك ئەوانەی ناوی پایتەخی شانشینی میدی ئەگباتانایان (یەکسانە بە هەمەدان) ناوە (ماڵی دایکو) لە دوای ئەو کوڕەی

هاتۆته سەرتەختی میدی کەباسی لە میژووی هیرۆدۆتسدا بە ناوی (فراورتیس PHAR-AORTES) ٦٧٢-٦٥٢پ.ز هاتووه، بەلام وا لاسەنگ ئەکریت کە ناوە راستەقینەکەی (خشاسریتا KHSHA-THRITA) بیت کە لە نووسینی پاشای ئەخمینی دارای یەکەمدا لە سەر چیای بیستوون هاتووه ئەمیان لە ئاستیکی بەرزی هیزدا بوو بە چەشنیك توانی لە ژیر فەرمانرەوایی خۆیدا زۆربەی هۆزە میدیەکان یەکبخا، هەربۆیە توانی لە سەردەمی پاشای ئاشووری ئەسەر حەدون (٦٨١-٦٦٩پ.ز) جۆریك لە هاوپەیمانی گریبدات لە نیوان دەولەتی ئاشووری و هەندیك لە میرە میدیەکان هەروەك چۆن لەو پەیماننامە رامیارییانەدا هاتووه کە ئەم پاشەیە گریی داوه لە گەل سەرۆکی ئەو هەریمانەی سەر بە ئیمپراتۆریەتی ئاشوورین بۆ ئەوەی (ئاشووری پانیپال ٦٢٧-٦١٨پ.ز) کوری ببیتە جینشینی، دەقی پەیماننامەکەش لە پشکنینەکانی ناردەی شوینەواری بریتانی لە نمرود، سالی ١٩٥٥ز دۆزرایەوه.

"خشاپریتا و فەراورتیس)ی پاشای میدی بەهیزیی گەشتۆتە ئاستیك کە پاشای ئاشووری ئەسەرحەدون نامەی هاوریێتی بۆ نارد. توانی سەرباری هۆزە میدییەکانیش هۆزە ئیرانیەکانی دیکەش بخاتە ژیر دەسەلاتی خۆیەوە کە گرنگترینیان کیمیریەکان و ئەسکیسیەکانە. بۆیەی ئەم پاشایەش گەشتۆتە ئەو ئاستەی، کە بریاری هیرشکردن بدات بۆ سەر نەینەوای پایتەختی ئاشووری. ئەم کارەشی کاریکی هەلەشەبوو، چونکە ئەو ئەسکیسیانەی هاوپەیمانیان لە گەل ئاشووریەکاندا کردبوو لە پشتەوە پەلاماریاندا و لە شەرەکەشدا دۆرا و لە سالی ٦٥٣پ.ز تیایدا کوژرا، بەو هۆیەش چەند ولاتیکی تری میدی کەوتنە ژیر رکیفی ئەسکیسییەکانەوە "وە نزیکەی بیست سال لە ژیر رکیفیدا مانەوە وەك چۆن میژوونووسی یۆنانی هیرۆدۆتس باسدەکات".

لە دوای پاشای میدی "فەراورتیس یان خشاپریتا" "کەی ئەخسار" ی کوڕی هات و توانیشی دەستبەرداری شوێنکەوتەیی ئەسکیسیەکان بێت، هەروەها دەسەلآتی خۆی سەپاندە سەر ولآتی فارس دا.

هەروەها کاری بۆ ڕێکخستنی سوپاکەی کرد و "ئەکباتانا" ی کردە پایتەختی هەمیشەیی خۆی لاسەنگی بۆچوونەکانیش ئەوەیە کە ناوەکەی لە زمانی میدیا مانای دووڕییان) دەدات، ئەکباتانا)ش تاوەکو کۆتایی سەردەمی سلوقی وەك شارێکی ئاوەدان مابوویەوە، بەلآم لە کاتی داگیرکردنی ئەسکەندەر بۆ ولآتی ئێران تالآنکرا لە دوای ئەوەی (کەی ئەخسار) بناغەی شانشینەکەی پتەو کرد بیری لە داگیرکردنی دەولّەتی ئاشووری کردەوە بۆ ئەوەش هەستا بە گرێدانی پاویەیمانی لە گەلّ نابوبولاسەر، کە فەرمانڕەوای ولآتی بابل بوو لە لایەن پاشای ئاشووری و ئاشوور پانیپالّەوە، بەهۆی ئەم هاوپەیمانیەتیەوە نابوپولاسەر لە شوێن کەوتی ئاشووریەکان کشایەوە.

پاشای میدی لە سالّی ٦١٥ پ.ز ڕووی هێرشەکەی کردە ولآتی ئاشوور و بەرەو نەینەوا لەشکرکێشی کرد، بەلآم بەرگرییەکی قورسیان کرد، پاشان ڕووی کردە شاری ئاشووری پایتەختی کۆنی ئاشووری و داگیرکرد. لێرەدا نابوبولاسەر بە پەلە لە گەلّ "کەی ئەخسار" کۆبویەوە هاوپەیمانیان لە نێوان ولآتی بابل و ولآتی میدیدا مۆر کرد، بە پێی ئەو هاپەیمانییە کچەزای پاشای میدی بە ناو (ئەمیتس) لە نەبوخزنەسەری کوڕی نابوبولاسەر مارە کرا، لە سالّی ٦١٢پ.ز توانی نەینەوای پایتەختی بگرێت و گڕی تێبەردات. بەهۆی ئەوشەوە سوپای ئاشووری کە بەسەرکردایەتی دوا پاشای ئاشووریەکان ئاشوور – ئوبلت) بوو، بەرەو حەران پاشەکشەی کرد و لە سالّی ٦١٠ پ.ز

ئاشوور – ئوبلت) لە ناوبراو بەوەش مـەزنترین ئیمپراتۆریـەت کـە جیهـانی کـۆن ناسبێتی کۆتایی پێهات.

لەسەردەمی (کەی ئەخسار)دا دەوڵەتی میدی بوو بە ئیپراتۆریەتێکی گەورە و لە گەڵ دەوڵەتی بابلیدا موڵك و ماڵی ئاشووریان دابەشکرد، کە شانشینەکەی وڵاتی میدیا و وڵاتی فارس و وڵاتی ئاشووری دەگرێتـەوە تـاوەکو سـنوورەکانی ئاسیای بچووك، کە ئەم ئیمپراتۆریەتە لە دوای کـەی ئەخسـار مـاوەیکی درێـژی نەخایانـد چـونکە (ئەسـتیاگز)ی جێنشـینی–وەك زانیاریـەکان ئامـاژەی بـۆ دەکـەن– نـوقمی ژیـانی ڕابـواردن بـوو، کـە یارمەتیـدەرێك بـوو بـۆ کچـەزاکەی کۆرشی یەکەم کە دەسەلاتی لێ بسەنێ و دەوڵەتی نوێ دابمـەزرێنێت بـە نـاوی دەوڵەتی ئەخمینیەوە.

لە کۆتایشدا ئامارەی ئەوە دەبینین کە چەند گۆڕێك لـە گـەڵ ئەشـکەوتێکی ناوچەی سلێمانیدا دۆزراونەتەوە، والاسەنگە کە بۆ میدیـەکان دەگەڕێتـەوە، کـە لـەم ئەشـکەوتانە دۆزراونەتـەوە "قزقـەپان" و "کـوڕ و کـچ" و دەکەونـە ڕووی شاخەکەوە لە پشت دێی شرناخ.

ئەمەو هەروەها وایبۆدەچن کە گۆڕی پاشا "فـەراورتیس" دەکەوێتـە نزیکـی (سری–بول) لە قەدپاڵی ڕۆژئاوایی چیاکانی زاگرۆس و ڕووەکەی بە هـەڵکولینی بـەرز نەخشـێنراوە. ئەمـەو ئـەو وێنـە پەیکەرسـازیانەی کـە ڕووی گـۆڕە شـاخاوییەکانی نەخشـاندووە، تـاکی میـدی بـەڕیش و سمێـڵ وێنـاکردووە و جلەکانی لە پێستی ئاژەڵـەو پێلاوێکـی بـەرزی لـە پێدایـە کـە لوتکـەی بـەرە و سەرەوە چەماوەتەوە.

سەبارەت بەوەی پەیوەندی بە ژیانی ئاسایی خەڵکەوە هەیـە لـە ناوچـەکانی زاگرۆس و کوردستان کە بۆتـە بەشـێك لـە میـدیا، بۆیـە ڕواڵـەتی ئـەو ژیانـە بـە

شارســتانی دۆڵی دوو روبــار کاریگــەر بــوو. مانییــەکان و میدیــەکانیش بــە شــێوەیەکی گشــتی پەچــەیەکیان پۆشــیوە تــا ســەر ئــەژنۆ، هەنــدیجاریش پشتوێنێکیان بەستۆتە سەری، بەڵام دەوڵەمەندەکان پێستی پڵنگیان لەبەر دەکرد بەرامبەر بە پێستی مەڕ لای هەژارەکان. بەشێوەکی گشتی ئەوان ریشیان دەهێشتەوە، هەروەك لە تابلۆ ئاشوورییەکانادا دەردەکەوت کڵاو قوچێکیان لەسەر کردووە کە لە لباو دورستکراوە، ئەم کڵاوانەش لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین و پێش گەیشتنی میدیەکان لە هەمان ناوچەدا بەکارهاتووە، هەروەها لە سەردەمی ئەخمینیشدا بەکارهێنانی بەردەوامبووە، هەروەها پێڵاوی نەرمی لە پێست دروستکراوی نوکبەرزیان بەکارهێناوە.

کەچی تاکی هۆزی (ئاریزانت) سووارەکان جۆری شەواڵێکی فلتیان لە پێکردووە کە تا ڕادیەك لە شەواڵی سکسییەکان دەچوو. سەرباری ئەوەش، میدیەکان جۆرێکی دیاریکراوی چەکیان بەکارهیناوە وەك خنجەر و شمشێر و ڕم، هەندێك لەوانەش لە شێوازی چەکە سکیسییەکان بوو، بە تایبەت ئەو شمشێرانەی بە (ئەکیناك) دەناسرێت، ئەوانیش وەك سکیس بە شێوەیەکی دیار ئەسپییان بەخێودەکرد.

ئەوەی پەیوەندی بەو هەوالانەوە هەیە کە لەسەر پاشاکانی ئیمپراتۆریەتی میدی بە زمانی خۆجێیەتی تۆمارکراون شتێکی زۆر دەگمەنە. لەو ناوچە مانییانەی کە دواتر بۆتە بەشێگ لە میدیا شێوە نووسینێکیان بەکارهێناوە کە زۆر پێی ئەچێ لە نوسوینی ئۆرارتییەوە داتاشرابێ. لە گەڵ ئەوەشدا لە دەوربەری دەریاچەی ورمێ لە میدیا شوێنەواری هەندێك لەو نووسینە هیرۆگلیفیانە دۆزراونەتەوە کە هاوتایە لە گەڵ هیرۆگلۆڤ ئۆراراتی، بە تایبەتی ئەو بەشەی لەو دەفرە ئاڵتونیە دەبینرێ کە لە زیویێە لە کوردستانی ئێراندا.

لێرەدا واباشە بوترێ کە سەرگەورانی کۆمەڵگا هەواڵەکانیان لە تۆمارەکانی خۆیاندا نووسیوە، چونکە ئەو هۆزانەی لە سەر دەشتەکێتی خۆیان مانەوە سەرکردەکانیان هیچ دەستنووسێکیان بە جێنەهێشتووە، سەبارەت بەمەش هیرۆدۆتس ئاماژە بەوە دەکات کە ((دیۆکیس پایەی خۆی لە سەر تەخت پتەو کرد و بەردەوامبوو لە چارەسەرکردنی کێشەکان بە دادپەروەری و کێشەکانیش بە نوسراوی بۆی ڕەوانە دەکرا))(٥). سەیر نییە ئەگەر نووسینە مێخیەکانی ئەو پاشا ئەخمینیانەی راستەوخۆ لە دوای میدیەکانەوەهاتوون لە بنچینەدا بگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لە نووسین کە تیایدا ئەو گەلە وشە ئاینی و ڕامیاریانە بەکارهاتوون کە هی میدیەکانە.

واباشە ئاماژە بەوە بکرێ کە ناگونجێ، کە پاشاکانی دەوڵەتی ئەخمینی نووسنێکیان هەبێ تایبەت بە خۆیان و لە بنچینەشدا سەر بە میدیەکان بن و لای پاشەکانی دەوڵەتی میدیش کەسەرگەورانی ئەوانن ئەو نووسینە نەبێت. سەرباری ئەم راستیانەش فارسە ئەخمینیەکان ناو و گەلە وشەی زۆریان لە زمانی میدیەوە وەرگرتووە، ئەخمینیەکان شێوازی (میثرا) ی میدیان لە جیاتی (میشا)ی فارسی کۆن بەکارهێناوە کە لە بنچینەشدا بۆ میششا)ی عیلامی دەگەڕێتەوە لە باسی ئەم خواوەندەدا. ئەم ناوەش بە لێکدراوی لای بلوتارخی مێژوونووسی یۆنانی بینراوە لە گەڵ خوداوەندی چاکەدا لە شێوەی (میسۆرۆماسدیس MESOROMASDES) لە ئێرانیشدا لە شێوەی (میجا–ئاهورامازدا) بەکاردەهات.

گەلە وشە هەن وەك خشاسر (فەرمانڕەوایی، دەسەڵات)، خشرابات (فەرمانڕەوای هەرێم)، جیسرا (کوڕەزا) وشە میدیەکانی تر کە لە نووسینە

ئەخمینیەکاندا لە جیاتی (خشاجا، خشاجابان، شیششا یان جیجا) ی فارسی بەکارهاتوون.

G.G.CAMERON, THE PERSEPOLIS TREASURY ) (TABLETS, CHICAGO, 1948, P 1.3

ئەگەر ئاینی مەزدی بۆتە ئاینی فەرمی ئەخمینییەکان لەسەردەمی داریوسدا، ئەوا بنەچەی ئەم ئاینە بەهەمان شێوە میدییە، بنچینەکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە چەمکێك کەلە نێو هۆزە هیندۆ ئەوروپییەکانادا باو بووە پێش کۆچە گەورەکانیان. کەچی ئەو ولاتەی دواتر بوو بە بناغەیەك بۆ میدیا، بە تایبەتی باکوور و رۆژهەلاتی دۆڵی دووروبار، دانیشتوانەکەی ئاینێکی تایبەتی خۆیان هەبووە کە هەزاران ساڵە تیایاندا چەسپاوە. بۆیە ئەتوانرێت ئەم بابەتە لە هەزارەی یەکەمی پیش زایندا لە چوارچێوەی دوو قۆناغی مێژوویدا پۆلێن بکرێت. یەکەم پەیوەندە بەو کە ماوەی دەکەوێتە پێش سەدەی حەوتەمی پێش زاینەوە واتە : پێش دروستبوونی ئیمپراتۆریەتی میدی و بلاوبوونەوەی چەمکە ئاینییەکانی لە نێو دانیشتوانە خۆجێیەتییەکان لە خوریەکان و مانییەکان و گۆتییەکان و کاشیەکان و لۆلۆییەکان کە بە هەمانشێوە کاریگەر بوون بەو چەمکە ئاینیانەی لە دۆڵی دوو رووباردا باوبوون. سەرباری بلاوبوونەوەی ناوە میدیە ناسراوەکان لە ناویاندا لە سەردەمی ئاشووریدا کە لە پێکهاتەیدا ناوی خواوەندە میدیەکانی وەك (ئاهورا، باکا، میترا)ی لە خۆ گرتووە، کە بلاوبوونەوەی میدیەکان دەردەخات لە ناوچەکانیاندا پێش دروستبوونی دەوڵەتی میدی یان بلاوبوونەوەی زمانی میدی لەم دەوروبەرەدا، ئەمان هیچ شوێنەوارێکیان بۆ بەجێنەهێشتووین کە پەیوەندی هەبێت بە ئامۆژگارییەکانی زەرادەشتەوە یان یاسای ئاهورا

مەزداوە. ماوەی دووەەمیش بە دەرکەوتنی چەند چەمکێکی جیاکار دەست پێدەکات لە دوای سەدەی حەوتەمی پێش زاینەوە سەبارەت بەو پرسە ئاینیانەی لە کوردستان و چیاکانی زاگرۆسدا بالاّ بوو. بۆ نموونە ناوی (بیت عەشتار) کە هەرێمێکی میدی سەر بە ئیمپراتۆریەتی ئاشورییە لە نووسینەکانی هیرۆدۆتسدا گۆڕاوە بۆ (ئەناهیتا)ی ئاڤێستایی کە ناولێنانێکی ئاریە بۆ خواوەندە عشتار، ئەنجا ناوی خاوەندەکانی وەك باکا، یەزەتا YAZATA لە نێو ناوە ناسراوەکان و ناوە جوگرافیەکانی ئیمپراتۆریەتی میدیدا بلاّوبوویەوە.

بە گشتی هەندێ لەو هێزە خواوەندیە خێرخوازیانەی دواتر لە ئاینی زەردەشتیدا باسی هاتبوو، پێش درەوکەوتنی خودی زەرادەشت لای میدیەکان ڕەگێکی هەبووە، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ میدیەکان چەمکی ئاینی تایبەت بە خۆیانیان هەبوو پێش ئەوەی ئاینی زەردەشتی دەرکەوێت کەوا لە واقیعدا بیروڕا باوەکانی نیو هۆزە ئاریەکانی لە دوو توێی کتێبێکدا کۆکردەوە کە بە ئاڤێستا ناسرا و لە دەورەوەی میدیا لە ناوچەکانی راکا (ڕی) لە رۆژهەلاّتی ئێران دەرکەوت زیاتر وایێ ئەچێ کە بەشێکی ئەم کتێبە کە بە (کاسا) ناسراوە بە زمانی خودی زەرادەشت نوسرابێ کە دەشێ دیالێکتێکی هۆزی ماکیان یان میدیەکان بێت، هیرۆدۆتس باسی ئاینی میدیەکانی بۆ نەکردووین ئەگەر چی هەندێ تایبەت مەندیشی هەبووە، بەلاّم ناوی هەر شەش هۆزە میدیەکەی هێناوە، لەوانەش MAGOI (ماکییەکان= ئاگرپەرستەکان).

یونانەکان ئاگایان لەوە هەبوو کە زەیوانەکان لە ئێراندا بە گشتی، چ لە سەردەمی میدیدا یان ئەخمینی، بۆ ئەو هۆزە میدیە دەگەڕانەوە کە ڕابەرایەتی کاروباری ئاینیەکانی نێو هۆزە ئاریەکانیان کردووە. هیرۆدۆتس ئاماژەی بەوە

کردووه کە دابونەریت و ڕێسا ئاینیەکانی ئەوان جیاوازە لەوەی لای فارسەکان هەیە، بۆیە لە نووسینەکانی بەهستووندا دەبینین داریوس ناوی ماکیە میدیەکانی وەك هۆزێکی جیاکار هێناوە نەك وەك تاکانێك لە کۆمەڵگادا چینێکی تایبەت بنوێنن. بەلام تێپەڕبوونی کات لەسەردەمی هللینیدا (لە دوای دەرکەوتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی) ناوی ئەم هۆزە واتای گشت پیاوە ئاینیەکانی ئێرانی دەبەخشی، کە لە ئیسلامیش دەرکەوت واتاکەی بوو بە (ئاگرپەرستان).

سەبارەت بە لایەنەکانی هونەری میدیش ئەتوانرێت لە ڕێگەی هەندێ پاشماوە و گۆڕستانەوە لە ئەشکەوتەکان وەك قەزقەپان و کوڕ و کچ و (دووکانداود)ەوە بناسرێنەوە کە پێدەچێت بۆ پاشا میدیەکان بگەڕێتەوە. بەلام هیرۆدۆتس هەرچەندە سەردانی نەکردووە بەلام، ڕێگەی بیستنی هەواڵەکانیەوە لایەنێك لە هونەری بیناسازی شاری ئەکاباتانای پایتەختی میدیمان بۆ دەخاتەڕوو دەڵێت (شوراکانی گەورە بوون، و لە شێوەی باونەیی یەك لە ناویەکدا بەرزدەبویەوە، شێوازی شارەکە وابوو لە شورایەك ئەوەندەی قولەکەی سەری لە شوراکەی تر بەرزتر بێت، ئەوەش تۆزێك، سروشتی زەوی ئەو گردە ببوە یارمەتیدەر کە شارەکەی لەسەر بنیاتنرابوو، کە نیمچە لێژبوو، بەلام ڕۆڵی گەورە لە بنیاتنانی لەسەر ئەو شێوازە هی هونەرە، شوارکانیش لە حەوت بازنە پێکدەهات دوا بازنەی گەوتبووە ناوەڕاستی کۆشکی پاشا و گەنجینەوە، شورا دەرەکیەکەی هاوچەشنی شورای ئەسینا بوو، قەلاکانیان ڕەنگیان سپی بوو، قەلاکانی شورای دووەمیش ڕەش بوو، سێیەمیان سوور، چوارەمیان شین، پێنجەمیش پرتەقالی، هەموو ئەم قەلایانە بە بۆیاخی ڕەنگاو ڕەنگ بۆیاخ کرابوون، بەلام قەلاکانی دوو شورای دوایین بە زیو ئالتون یەك لە

دوای یەك داپۆرشرابوون، دیۆکیس ئەم هەموو قایم و قۆڵییەی لە پێناو خۆی و کۆشـەکەی دەکـرد، بـەڵام خەڵکەکـە پێویسـت بـوو ماڵـەکانیان لـە دەرەوەی سنووری شوراکان بنیات بنێنن). (هیرۆدۆتس، کتێبی یەکەم، بەشی ٩٨).

ئەم زانایانە لەسەر پایتەختی میدیەکان، لـە دوای هیرۆدۆتـس (پۆلیبیـۆس) لەسەردەی دووەمی پێش زایندا ٢٠٤–١٢٢پ.ز جارێکی تر دووبارەی کردۆتـەوە کرۆکـی باسـەکەی لـە قسـەی پێشـینانی جیـاوازتر نییـە، سـوودی لـە زانیـاری هاوچـەرخانی و ئـەو کەسـانەی هاوچـەرخی ئەسـکەندەری مەکـدۆنی بـوون وەرگرتووە. ئەگێڕنەوە کـە ئەمشـارە هـیچ بنەمایـەکی جـوانی تێـدا نـەمابوو، و کۆشکێکی لە ناوەڕاستدا هەبوو دیوارەکـەی حـەوت سـتاد بـووە (نزیکـەی یـەك کیلۆمەتر)، ماڵەکانیشی بە داری سەرو دروستکرابوون رازێنرابوونـەوە، دەرگـا و هۆڵەکانی ئەو کۆشکەش بە ئاڵتوونی تایبەت ڕووپۆش کرابوون. بـە هەمانشـێوە بنیـاتنرابوون. وەك دەردەکـەوێت زۆربـەی ئـەم پیشەسـازیانە لـە سـەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنی و دوای ئەویش لەم شارەدا دزراوە، لەوانەشە پاشـاکانی ئـەخمینی هەنـدێکیان گواسـتبێتەوە بـۆ جوانکـاری پایتەختـە نوێیەکـەیان، هەرسیبۆلیس لە هەرێمی فارس. بە هەرحاڵ مێـژوونوس بۆلیبیـۆس لـە وەسـفی شاری ئەکباتانادا بەم وشـانەی لای خـوارەوە پاسـاوی بـۆ بۆچـوونەکانی خـۆی هێناوەتـەوە ئەمشـارە باشـترین بابەتـە ئـەو نووسـەرانە رێیـان تێکـەوێ کـە بـە واقورمانـەوە دەڕواننـە شـوێنەوارەکانی و ئەوانـەی ئـالوودەی زێـدەڕەوی و نووسـینی سـاختە بـوون. بـەڵام دەبێتـە مایـەی قورسـی شـلوقییەکی زۆر بـۆ ئەوانەی وەکو من لە کـاتی وەسفکردنی شتە نەباوەکانـدا وریـا و بـە ئاگـان... کۆشکەکە پارچە زەوییەکی گرتۆتەوە ڕووپێوەکەی سێ چـارەکە میـل دەبێـت، بـە نرخـی دروسـتکردنەکەی بەڵگەیـە لـە سـەر دەوڵەمەنـدی بنیاتنـەرە

یەکەمەکانی، ئەو دارەی لە بنیاتنانی بەکارهاتووە لە داری ئەرز و سەرووە، و گشت کۆڵەکە و دارەڕای بنمێچەکەی و نەخشە تۆڕییە هەڵکۆڵراوەکانی ناوی، هەمووی بە پلێتی زیو یان زێڕ ڕووپۆش کراون.

## بەشی یەکەم

# کوردستان لە هەر دوو چاخی هللینی و مەسیحیدا

ئەسکەندەری کوڕی فلیپی مەکۆدنی ساڵی ٣٣١پ.ز، لە ڕۆیشتنی بەرەو ناوچە شاخاوییە کوردیەکان بەردەوام نەبوو، بەڵکو لە نزیك پشخاپوور (فیش خاپوور) لە رووباری دیجلە پەڕیوە و بە درێژایی کەناری لای راستی ئەم رووبارە رۆیشت، ئەنجا بایداوە بەرە و باشووری رۆژهەڵات ڕووە و شاری هەولێر و لە دەوروبەریدا گەیشت بە ئیمراپۆریەتی ئەخمینی، داریوسی سێیەم لە شوێنێك نزیك بە گردێك کە پێی دەوترا (گەوگەمیلا GAYGAMELA) واتە: کۆپارەی وشتر پێویستیشە لە پاڵ هێزە هۆزیەکاندا، هۆزە خۆجێیەجیەکانیش بەشداربن بۆ چوونەسەر دوژمنەکەی و، دواکەوتنی لە ولاّتی میدیادا، کە یەکەمجار پاشای ئەخمینی پەنای بۆ برد، ئەسکەندەر لە دوای تێپەربونی بە بابلدا چیاکانی زاگرۆسی بەزاند، ئەنجا دەستیگرت بەسەر (ئەکباتانا) ی پایتەختی کۆنی میدیەکاندا (٢)، هەروەها چووە ناو ناوچە کوردیە باشوورییەکانەوە لە ناوئیمپراتۆریەتی ئەسکەندەردا.

لە دوای مردنی ئەسکەندەر ساڵی ٣٢٣پ.ز زۆربەی ناوە کوردییەکان بەر پشکی دەوڵەتی سلوقس کەوت و، بە تێپەربوونی کات سیمای شارستانیەتی هللینی تێدا بلاّوبوویەوە، لە بەر ئەوەی یۆنانیەکان چینی دیاری ناو کۆمەڵگاکانی

بوون، بۆیە سەیر نییە کە زۆربەی ئەو دراوانەی لە کوردستاندا دۆزراونەتەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوان، چ لەوانەی وێنەی خودی ئەسکەندەری پێوەیە یان پاشا سلوقیەکانی جێنیشینی.

هەروەها ئەو بەڵگەنامانەی لە ناوچەی هەورامانی کوردیدا دۆزراونەتەوە دوانیان بە زمان نووسینی یۆنانی تۆمارکراون کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٨٨پ.ز و ٢٢ پ.ز، بەڵگەیەکن لەسەر بڵاوبوونەوەی سیمای شارستانیەتی هیللینی لە ناوچە دوورە دەستەکانی کوردستاندا.(٣)

سەرباری ئەو راستیانەی باسکران، ناولێنانە جوگرافیەکانی هەندێ ناوچەی کوردستان پێنجوێن= پێنج وێن = یۆن پێنج، هەروەها بتوێن = ماڵی وێن (یۆن) هەروەها ناوەکانی دیکەش بەڵگەن لە سەر بڵاوبوونەوەی یۆنانەکان و تێکەڵبوونیان بە خەڵکی ناوچەکە.(٤)

دەرچۆنێکی لە ناوئیمپراتۆریەتی سلوقیدا لە ناوەراستی سەدەی سێیەمی زایندا، چەند هێزێکی رامیاری ناوخۆیی دەرکەوت، بە تێپەربوونی کات لە ناوچەکانی ژێر ڕکێفی خۆی جڵەوی حوکمرانی دەگرتە دەست، ئەنجا بوو بە هۆکارێك بۆ رووخاندنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا مانییەکان لە زۆربەی ناوچەکانی رۆژئاوای ئاسیادا. دیاترین ئەم هۆزانە لە ناوچەی (پارسیا) لە رۆژهەڵاتی دەریاچەی قەزوین دەرکەوت، بە رابەرایەتی خەڵکێك لە دشەتەکانی هۆزی (ساکا)ی کۆچەری، کە ئاستی شارستانیان لە ئەخمینیەکان نزمتر بوو و، پێدەچێت فەرمانڕەواکانیان لە دوای سەرکردایەتی ئیمراپۆریەتێکی درێژە دەست بۆ ماوەیەکی زۆر بە نەخوێندەواری مابێتەوە، لە مێژوودا لە دەوری ٢٥٠ پێش زاینی دەرکەوتوون لەو کاتەی بە رابەرایەتی (ئەرشاك ARSACES) لە سلوقیەبکان جیابوونەوە. ململانێی نێوانیان بەردەوام بووە تا ئەو کاتەی

میتراداتی یەکەم دەستی گرت بەسەر هەندێ لە ناوچە کوردیەکاندا و هاتە عێراقەوە لە دەوری ١٤١ پیش زاین، بەلاّم سلوقییەکان هەولّیاندا لێیان بسەننەوە، کەچی ئەفراهاتی دووەم (١٢٨-١٢٤ پ.ز) توانی سەرکەوێ بەسەر هێزە سلوقیەکاندا لە ئێران، پاشان لە سەردەمی ئەرتەبانی دووەمدا (١٢٨-١٢٤ پ.ز) فەرمانڕەوایەتییەکەیان لە رۆژئاوای ئاسیادا بەرقەراربوو، ولاّتەکەیان ناوبانگی بە ئیمپراتۆریەتی فرسی یان ئەشکانی دەرکرد.

سیستەمی بەرێوەبردنی دەولّەتی فرسی لە سەر شێوەی هەرێمایەتی بوو و پاشا خۆجییەکان بەرێوەیان دەبرد و، بە پاشای تایەفەکان دەناسران، بەلاّم هەندێ ناوچە بە تایبەتی (تاك) کە دەکەوتە سەر سنووری هەردوو ئیمپراتۆرەیتی فرسی و رۆمانی لە باکووری میزۆپۆتامیا سەقامگیریەکی زۆرتری بە خۆوە بینی. ئەرمینیا بارودۆخێکی تایبەتی هەبوو، ئەوانەی فەرمانڕەواییان دەکرد وایان پیشان دەدا کە لە نەوەی ئەرشاکین، کەچی ناوچە کوردییەکان بە تایبەتی هەریەك لە ویلایەتی کوردۆئینی و ئەدیابینی (دیاربەکر و هەولێر) ئەوپاشایانە فەرمانڕەواییان دەکرد کە خەلّکی هەمان ولاّت بوون بە شێوەی ویلایەتەکانی ئوسەروینی (جەزیرە) و هاترا (حەزەر) و سوزیفینی شانشینەکانی دیکەش.

لە کۆتایی سەدەی دووەم و سەرەتای سەدەی یەکەمی پێش زاینیدا و لە گەلّ فراوانکاری دەسەلاّتی فرسەکان و ئەو گۆرانکارییە رامیارییانەی رۆما بە خۆیەوە بینی، ئاسیای بچوك و ئەرمینیا و کوردستان بوون بە مەلّبەندی ململانێی نێوان هەردوو ئیمپۆراتۆریەتی فرسی و رۆمانی، ئەو بارودۆخەش بوو بە فاکتەرێك بۆ دەرکەوتنی هێزە رامیارییە نوێکان لە ناوچەکەدا لەوانەش شانشینی

ئەرمەن بەرابەرایەتی پاشای بەرزخوازی تیکرانی گەروە و میسراداداتی شەشەم پاشای بونتس.

ململانێکە لە رۆما لە نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران (سیناتۆ)دا مابوویەوە و ماریۆس و سۆلا، کە دوو ئەفسەری دژ بە یەك بوون توانیان رۆما لەو قەیرانە رامیاریە قوتاربکەن لە ساڵی ١١١ پ.ز، هەروەها هەستان بە یەکخستنەوەی سوپای رۆمانی و گێڕانەوەی سەقامگیری ڕامیاری ئەوەش بە گژاچوونەوەی ئەو کەسانەی لە هەریەك لە ئاسیا ئەفریقادا لە دەسەڵاتی رۆمانی یاخی بوون.

لەم ماوەیەشدا میتراداداتی شەشەم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکەوە رووبەری شانشینەکەی لە سەر حسابی ئیمپراتۆرەیتی رۆمانی فراوانکرد و، فەرمانبەر و بریکارە رۆمانییەکانی لەو ناوچانە دەرکرد کە داگیری کردوون. هەربۆیە (سۆلا)ی راسپارد بە گێڕانەوەی فەرمانبەر و بریکارەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان، لە سەرەتاوە پەیمانێکی لە گەڵ فرسەکان بەست دوای ئەوە ساڵی ٩١ پێش زاین گەڕایەوە بۆ رۆما بۆ سەرکردایەتی کردنی پارتی دیموکراتی تیایدا. بەڵام میتراداتی پاشای بونتس توانی دەستبگرێت بەسەر کەبدوکیادا، پاشان هەولێیدا دەستەبەسەر شانشینی بیرکارمون (بیرجامون)دا بگرێت لە کەناری دەریای ناوەڕاست لە باشووری ئاسیای بچووکدا، ئەنجا چووە ناو کلیکیا و لە ساڵی ٩٠ پ.ز وڵاتی بیسینیای داگیرکرد، کەچی لە دوای یەکساڵ پاشەکشەی تیاکرد. دەرەنجامی ئەم رووداوانەش، رۆما بڕیاریدا بە سەرۆکایەتی (لوکوللوس LUCULLUS) هێزێکی سەربازی پیادە و کەشتیگەلێکی دەریایی بنێرێت بۆ رووبەرووبوونەوەی ئەو کێشانە و دانانی سنوورێك بۆ بەرزخوازی هەردوو پاشای ئەرمەن و بونتس (٧).

له لایەکی ترەوە تیگرانی ئەرمەنی زاوای پاشای بونتس هیچ گوێی نەدایە ئامادەباشیە رۆمانیەکان، و توانی دەستبگرێتە سەر هەرێمی کەبدوکیا و کوردۆئینی (ولاّتی کورد– دیار بەکر و دەوروبەری) و گشت ناوچەکانی باکووری دۆڵی دووروبار و باکووری سوریا. بەوەش هەردوو پاشا میترادات شەشەم و تیکرانی گەورە کەنارەکانی هەردوو دەریای رەش لە باکوور و دەریای سپی لە باشوور بە دانیشتوانەکەشیانەوە گەمارۆدا.

لە دەرەنجامی ئەو رەوشەی لە ئاسیادا هاتەکایەوە، کەشتیگەلی رۆمانی ساڵی ٨٥ پ.ز بەسەرکردایەتی لوکوللوس لە دەریای ئیجە دەرکەوت و شەڕ لە نێوان ئەم کەشتیگەلە و ئەو هێزە دەریاییانەی میترادات لەوێ رێکخستبوون روویدا، و نەیانتوانی لەبەردەم رۆماندا خۆڕاگربن، بەوەش رێگە خۆشبوو بۆ (سولا) کە لە وشکانیەوە دزە بکا بەرە و ئاسیای بچووك، لەم کاتەشدا یۆنانەکان کە پێشتر دڵسۆزی خۆیان بۆ میتراداتی پاشای بونتس دەربڕیبوو وایانلێهات رووی دڵسۆزیان بکەنە رۆمان. رەوشەکە بە شێوەیەکی گشتی لە بەرژەوەندی میسراداتا نەبوو، لەبەر ئەوە هەوڵێکی زۆریدا لە گەڵ (سۆلا)دا ئاشتەوایی بکات و سولاش ئارەزووی لێبوو بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ رۆما بۆ ئەوەی لەوێ بەسەر نەیارە رامیارییەکانیدا سەربکەوێت. ئاشتبوونەوەکە لە ساڵی ٨٥ پ.ز لە شاری (دەردانوس) نزیك شوێنی تەروادەی کۆن بەرپابوو، بەو پێیەش میترادات لەو ناوچانە پاشەکشەیکرد کە لە ئاسیای بچووکدا داگیریکردبوو، سەرباری ئەوەش کە دەستی لە چەند کەشتیەکی سەربازی هەڵگرت ناچارکرا سەرانەیەکی گەورەش بدات بە مەرجی ئەوەی شانشینی بۆنتس بگەڕێتەوە بۆ ئەو سنوورەی کە پێشتر هەیبوو، بەدیدی میترادات مەرجەکان قورس بوون، و دەستی دایە بەهێزکردنی شانشینەکەی و رێکخستنی سوپاکەی بۆ ئەوەی جارێکی دیکە

رووبەڕووی رۆمانەکان بێتەوە، سەرباری ئەو لاوازیەش کەباڵ کێشابوو بەسەر دەسەڵاتی رۆمانەکان بۆ سەر ئاسیاییەکان لە دوای جێگیربوونی کەشتیگەلیەکان لە دەریای ناوەڕاستدا کە لە هەموو شوێنێکدا هێرشیان دەکردە سەر رۆمانەکان بگرە لە خودی ئیتاڵیاشدا، بازرگانیشیان بە دیلەکانیانەوە دەکرد. بە گوێرەی ئەو مەترسییانەی لە سەر بەرژەوەندی رۆمانییەکان دەرکەوت لە ئاسیادا، (ئەنجوومەنی ساناتۆ) لە رۆما بریاریدا هێزێك بنێرێ بەسەرکردایەتی (سرفیلیۆس) بۆ ناوچەکانی (لۆکیا و بامفۆلیا و کیلیکیا) لە ئاسیای بچووك کە لە ژێر دەستی رۆمەکان درچووە، کەچی ئەم پیلانە پێش ئەنجامدانی هێرشەکە بارکەوت، ئەوەش بەهۆی دەرکەوتنی هێزێکی هەرزەی نوێ لە رۆژهەلاتی ئاسیای بچووکدا، ئەویش هێزی شانشینی ئەرمەنییە لەسەردەمی پاشا تیکرانی یەکەم زاوای میتراداتی پاشای بونتس.(٨)

تیکران دەستی دایە فراوانکردنی رووبەری شانشینییەکەی، لەسەرەتاشدا بە داگیرکردنی ناوچە کوردیەکان، پاشان دەستی گرت بەسەر کەبدوکیا و باکووری میزۆپۆتامیا و، ئەو ناوچانەی لە ژێر فەرمانڕەوای فرسدا بووە. لە ساڵی ٨٣ پێش زاینیشدا سوریا بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی ئەرمەنی گەورە، میتراداتیش لای خۆیەوە هەوڵیدا تەگەرە بۆ رۆمان دروست بکات لە دەستبەسەراگرتنی بەسەر (بسینیا) لە ئاسیای بچووك، چونکە بەم رێگایە ئەیتوانی دەست بگرێ بە سەر دەریای رەشدا و رێگەی دەردەنیل و بسفۆر بە رووی رۆماندا دابخات. لەبەر ئەوە لایەنگری کوڕی پاشای بسینیای دەکرد لە وەرگرتنی تەختی دەسەلاتی ئەو ولاتە لە دوای مردنی باوکی بۆ گەیشتن بە مەرامەکانی، ئەمەش مەترسی بۆ سەر رۆما دروست دەکات کە لە کۆتاییدا ئەمیش بڕیاریدا هەڵمەتی سەر ئاسیا لوکولۆس سەرکردایەتی بکات، ئەو هەڵمەتەی کە لە دەستپێکیدا بارکەوت. لە

ساڵی ٤٧ پ.ز میترادات توانی بسینیا داگیر کات و دەست بگرێت بە سەر زۆربەی هەرێمەکانی ئاسیای بچووکدا و، بۆ ماوەیەکی کەم شاری کۆزیکۆس لەسەر دەریای مەڕمەرە گەمارۆ بدات، لە بەر ئەوە لە کوللوس پارمەتیەکانی لێگرتەوە. لە پاش ئەوەی میترادات تووشی زیانیکی گەورە بوو ئەنجا بەرەو بسینیا گەڕایەوە.

لۆکۆللۆس بەردەوام بوو لە ڕاوەدوونانی پاشای بۆنتس کە لە دوایدا پەنای بۆ ئەرمینیا برد، و سەرکردە رۆمانییەکە داوای لەپاشای ئەرمینیا کرد کە میتراداتی ڕادەست بکات، بەڵام تیکرانی پاشای ئەرمەنی داواکاریەکەی بە جێنەهێنا، بۆیە بە ڕەزامەندی ئەنجوومەنی (سیناتۆ) لوکۆللوس هەستا بە ئەنجامدانی هەڵمەتێك بۆ سەر ئەرمینیا و تیکرا نوکوتایی پایتەختی نوێی (شاری میا فراقین ی کوردی) لە ٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٦٩ پ.ز داگیر کرد. مێژوونووس بلوتارخ باسی هەڵوێستی ڕامیاری ئەم ناوچانەمان بۆ دەکات لەو ماوەیەدا، دەڵێت تیکرانی وڵاتی کوردۆئینی لە گەڵ مەڵبەندەکەی ئامەد (دیاربەکری ئێستا) داگیر بکات و (زاربیونۆس)ی پاشای لەناوبرد کە لوکۆللوس شاری تیکرانوکرتای کردە بارەگای خۆی، شاندی فەرمانڕەواکانی ئەدیابینی (حزیب) لە هەولێر هەروەها ئاشوور و کوردۆئینی و کەبدوکیا سەردانیان کرد و ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بچنە پاڵی.

بلوتارخ درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت پاشاکانی میدیا و کوردۆئینی و ئەدیابینی و عەرەبەکانی باشووری بابل و ئەلبان (داغستانی ئێستا) و ئەیبیریەکان (جۆرجیای سۆڤیەتی پێشوو) و دانیشتوانی رووباری ئاراکس هەمویان لای لوکۆللوس ئامادەبوون. بەڵام زاربیونۆس پاشای کوردۆئینی پێش گەیشتنی رۆمان بۆ ئەو ناوچانە لە گەڵ منداڵەکانی و ئەندامانی خێزانەکەیدا کوژرا، لوکۆللوف سیش ئەم هاوپەیمانییەی ڕۆمانی لە بیر نەکرد و، کاتێك

گەیشتە ولاتی کوردۆئینی لوکۆللۆس ئاهەنگێکی فەرمی گێڕا بۆ پایەی زاربیونۆسی پاشای کوردۆئینی، تەرمەکەشی بەو زێڕ و زیوەوە ناشت کە لە شەڕی دژ بە تیکرانی ئەرمەنی دەستی کەوتبوو. ئەنجا لوکوللۆس بە دەستی خۆی مەشخەڵی ئاهەنگەکەی گێرا و، پارەیەکی زۆری بەسەر کەسو کار و ناسراوەکانی زاربیونۆسدا دابەشکرد، و فەرمانیدا پەیکەرێکی گەورە بۆ ئەم پاشا کوردۆئینیە دروست بکرێت.(٩)

لوکوللوس لە راستیدا سەرکردیەکی سەربازی بەهرەمەندبوو، پیلانەکەی ئەوەبوو سوپای ئەرمەنی پەلکێشی ئەو شوێنە بکات کە خۆی دیاریکردووە بۆ شەڕ، لە راستیشدا تیایدا سەرکەوتووبوو، و لە کاتی بەشەڕهاتندا هێزەکانی رۆمـان وردە وردە دەکشـانەوە، هێـزە ئەرمەنیـەکانیش کەوتـە نێـوان هەردووکیانەوە، لەو کاتەدا دوای کەوتن.

هەرکە هێزە ئەرمەنییەکان گەیشتنە بەرزاییەکانی کوردستان سوار و پیادە رەوەکانی رۆمان لە پشتیانەوە بۆسەیان بۆ دانان، تاوەکو لە پرێکا چوونەسەر ئەرمەنەکان، ریزەکانی سوپای ئەرمەنی تێکشا، ئەنجا بە تەواوەتی لە ناوچوو، رۆمانیش توانی دەست بگرێت بەسەر ماڵو ماڵکی شانشینی تیکراندا لە ناوچە کوردیەکان و ناوچەکانی تردا، بەلاَم تیکران جارێکی دی لە گەڵ میتراداتی خەزوریدا لە گەڵ سوپایەکی تێکەڵ لە ئەرمەن و کوردو کەرەج و ئەلباندا گەڕایەوە، بەلاَم لوکۆللوس دووبارە پەڕییەوە بۆ چیاکانی هۆرۆس و چووە ناوچە کوردیەکانەوە تاکو گەیشتە ویلایەتی موش، بەڕێوەبوو بۆ رووبەڕووبونەوەی تیکران کە (ئەردەشاد)ی پایتەختی کۆنی کردبووە مۆڵگەی خۆی.

هەردوو سوپاکە لە شەڕێکی دڕندانەدا بە یەك گەیشتن و هێزەکانی تیکران و میترات هەندێك لەو هۆزە رۆمانیانەیان بەزاند کە بۆ بنکەکانی خۆیان لە نسەیبین

کشانەوە، هەواڵی تێکشکانی لوکۆللوس لە شەری رووباری ئەرزانی (موورادسۆی ئێستا) گەیشتە ئەنجوومەنی پیران لە رۆما بۆیە بریاریدا لە ئەرکەکەی دوور بخرێتەوە لە کاتی ئەم رووداوانەدا و لەو کاتەی دەوڵەتی میترادات لاوازی و نیشانەکانی رووخانی تیاکەوت، فەرهادی سێیەم (فەرائاتیسی ناسراو بە بسیۆس) لە دوای مردنی سەنە ترەق (سیناتروکس)ی باوکی هاتە سەرتەختی ئیمپراتۆریەتی فرس. فەرهادی سێیەم دەستی گرت بەسەر ناوچەی (هەفتا دۆڵ) کە پێشتر تیکران داگیری کردبوو، ئەنجا دەستی دایە داگیر کردنی ناوچەکانی هەولێر و باکووری دۆڵی دوو رووبار بە گشتی.(١٠)

لە دوای تێپەربونی ساڵێك بەسەر ئەم رووداوانەدا، لوکۆللوس بە مەبەستی داگیرکردنی هێرشی کردە سەر ئەرمینیا، کەچی سەربازەکانی بەهۆی دوورە دەستیان لە ولاتەکانیانەوە گوێرایەڵی نەبوون، پاشان ئاراستەی سەربازەکانی بەرە و میزۆپۆتامیا گۆری، بەمشێوەیە هەریەك لە تیکرانی ئەرمەنی میتراداتی پاشای بۆنتس لە مەترسی رۆمان رزگاریان بوو.

لەم کاتانەدا ئەنجوومەنی (سناتۆ) دەسەلاتەکانی لوکۆللوسی کەمکردەوە و، لە کاتی خۆیدا ئەو هاوکاریی و هێزە یەدەکانەی پێ نەگەیشت کە داوای کردبوو، لە دوایدا سەرکردایەتی گشتی سوپای رۆمانیەکان لە ئاسیادا لە جیاتی لوکۆللوس سپێرایە بۆمبی، هەردوولایان لە باکووری رووباری هالیس لە ئەنادۆڵ چاویان بە یەك گەیشت، لە دوای دانیشتنێکی پر لە مشتومر و هەرەشە و گورەشە، بۆمبی سەرکردایەتی لێوەگرتەوە(١١)، ئەنجا بیری لەوە کردەوە جڵەوی دەسەلاتی هەردوو ناوچەی سۆفینی و کوردۆئینی بداتە دەستی کورەکەی تیکران، بەلام دای بە ئەریۆ بارزانی یەکەمی کەبدوکی و پێش ئەوەی هێرش بکاتەسەر بۆنتس بۆمبی لە گەڵ فەرهادی ئیمپراتۆری فرس رێکەوتنێکی

گرێدا کە پەیوەندی لە گەڵ پاشای ئەرمەنیدا ئاڵۆز بوو، بۆمبی هانیدا بۆ هێرشکردنەسەر ئەرمەن بۆ ئەوەی تیکران سەرقاڵ بێت بە فرسەکانەوە، و خۆشی تێبکۆشی بۆ شەڕی میترادات. بەمشێوەیە هێرشی کردەسەر پاشای بۆنتس کە نەیتوانی خۆی ڕاگرێ لەبەردەم هێزەکانی بۆمبیدا، بۆیە جارێکی تر پەنای بۆ تیکرانی زاوای برد.

لەبەر ئەوەی تیکران لەکاتی شەڕدا بوو لە گەڵ فرسەکاندا، نەیتوانی داڵدەی میترادات بدا و دەستگیری کرد، کەچی توانی هەڵبێت و لە دوای ئەم ڕووداوە لە مێژووی دەوڵەتی ئەرمەنیدا گۆڕانکاری مەترسیدار ڕوویدا، کوڕەکەی تیکران لە باوکی هەستا و بە فەرمی داوای لە بۆمبی و هێزەکانی کرد بچێتە وڵاتی ئەرمەنەوە، بەهۆی ئەوەشەوە باوکی دەست بەجێ خۆی دا بە دەستی ڕۆمەکانەوە و، بەوەش جگە لەوەی بە تەنیا میترادات لە ناوبەرێ هیچی تری بۆ نەمایەوە، ئەمجا بۆمبی هەستا بە دەرکردنی (ئەفرانیۆس) کە نێردرابوو بۆ فەرمانڕەوایەتی لە کوردۆئینی ساڵی ٦٥ پ.ز.(١٢) لەم ماوەیەدا لە پەیوەندی فرس- ڕۆمان ڕەوشێکی نوێ دەرکەوت، فەرهاد هەوڵیدا وڵاتی کوردۆئینی لە دەستی ئەرمەن دەربکا و بیخاتە سەر ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی، بەڵام ئەرمەن بوو بە ڕێگرێك لەبەردەم بەدیهێنانی ئامانجەکانی فرسدا، ئەنجا دەستی گرت بەسەر کورۆئینیدا، ئەوکات فەرهاد داوای دانووستان و ڕێکەوتنی کرد، بەڵام ئەوەی کە فرسەکان ویستیان بۆمبی بە جێی نەهێنا، و دەسەڵاتی سەر کوردۆئینی گەڕاندەوە دەستی ئەرمەنەکان، ئەنجا بۆمبی دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی کارە کارگێڕی و ڕامیاریەکانی ئەو شانشینە خۆجێیەجیانەی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك و کوردستاندا لە مەترسییەکانی میترادات و تیکران ڕزگاریان بوو و هەندێ یاسای تایبەتی بۆ دیاریکرد کە لە بەندەکانیدا

دەرپەڕاندنی ژیانی هللینی لە نێوان کۆمەڵگاکانی و ڕێکخستنی کاروبارەکانی لە سایەی دەوڵەتی شاری (پولیس)دا چەسپاوە، ئەم شانشینانەش بە تەنها شانشینی ئەدیابینی (حزیب)ی لاخستووە، کە مەڵبەندەکەی هەولێر بووە و دراوتە فرس، پەیوەندی نێوانیشیان بۆ ماوەیەکی درێژ بە باشی ماوەتەوە.

بۆمبی دانیشتوانە خۆجێیەکانی ڕۆژئاوای ئاسیای هاندەدا بۆ نیشتەجێ بوون لە شارەکاندا. ۳۹ شاری لە ئاسیای بچووك و سوریادا بنیاتناوە و سەرباری ۱۱ شاریش لە هەریەك لە بسینیاو بۆنتسدا بە مەرجی ئەوەی هەر دەوڵەتێك ئۆتۆنۆمی خۆی هەبێت. هەروەها هانی ڕامیاریەکانی ئەو ولآتەی دەدا خاوەنداریێتی زەوی زارەکان بکەن لە گەڵ ئەوەی ڕێژەی دە یەکی بەروبومەکەی بدرێتە ڕۆمان لە پاڵ ئەو باج و سەرانەی دیاری کردووە بۆ هەر شارێك.(۱۳)

ئەم سیاسەتەی بۆمبی لە ڕۆژهەلآت گرتیەبەر دوو دیاردەی هێنایە کایەوە، یەکەمیان دەرپەڕاندنی ژیانی هللینی لە بلآوبوونەوەی زمان و نووسین و هونەری تەلاسازیی و دیاردەی جۆراوجۆری ژیانی یۆنانی لە شوێنە جیاجیاکاندا. دووەمیشیان پەیوەستە بە پەیوەندی ئابووری و ڕامیاری شانشینە خۆجییەکانەوە. ئەو دیکۆمێنتە مێژووییانەی بە یۆنانی نوسراون و لە هەوارمان دۆزراونەتەوە ڕاستی ئەم دوو دیاردەی سەلماندووە.

لە ڕۆما یولیۆس قەیسەر لە ساڵ ٤٤ پ.ز تیرۆرکرا و کەسی بە جێنشینی خۆی دانەنا بۆیە قەیرانێکی ڕامیاری لە پایتەختی ڕۆمانی هاتەکایەوە. لە دوایدا پارتەکەی قەیسەر کە مارکۆس ئەنتۆنیۆسی (۸۲–۲۰پ.ز) قونسوڵ سەرۆکایەتی دەکرد، بە سەر ڕەوشەکەدا زاڵبوو بە شێوەیەکی چاوەڕوانەکراو (ئۆکتافیانوس ٦۲–۱٤پ.ز) ی کوڕی قەیسەر بەرپەرچی دایەوە و گەیشتە ڕۆما بۆ داواکردنی میراتی قەیسەر، هەرچەندی مارکۆس ئەنتۆنیۆس گرنگی نەدا بە دوژمنە

لاوازەکەی، کەچی لە دواییدا بە دەستی ئەو کۆتایی پێهات.لە دوای ئەوەی هەردوولا ڕێکەوتنێکیان گرێدا لە تارینتۆم ئەنتۆنیۆس ساڵی ٣٦ پ.ز بەرە و ڕۆژهەڵات بەڕێکەوت، هەوڵیدا لە ڕێگەی ئەمینیاوە بچێتە ناو میدیا و ئەتروباتینی (ئازەربایجان) بۆئەوەی لەوێوە هێرش بکاتەسەر فرس، کەچی ئەرمەنەکان لەم ماوەدا پاڵپشتی فرسەکانیان دەکرد و لەم ساڵەشدا ئەنتۆنیۆس بیست هەزاری لە سەربازەکانی لە دەستدا لای باکووری کوردستانەوە، بۆیە ڕای خۆی گۆڕی لەم هێرشکردنەی بۆ سەر فرسەکان. نیلسون دوابواز باسدەکات کە ((مارکۆس ئەنتۆنیۆس لەم ماوەیەدا لە گەڵ میدیەکان ڕێکەوت بۆ شەڕکردن لە گەڵ فرسەکاندا، کەچی فرسەکان بە هاوکاری (ئەرساکس)ی کوڕی پاشای ئەرمەنی کە پەنای بردبووە لایان، توانیان سەرکەون بەسەر ڕۆمان و ئەو میدیانەی لە گەڵیاندا هاوپەیمان بوون)) (١٤)، لەبەر ئەوە دەستبەجێ مارکۆس ئەنتۆنیۆس لە ناوچە کوردیەکان کشایەوە (لەم کاتەدا میدیەکان هۆزە کوردیەکانیان پێکدەهێنا) و ڕووی کردە ئاسیای بچووک و ساڵی ٣٧ پ.ز لە ئەنتاکیا شاژنی میسری مارە کرد و چووە میسر.

ئیتر ڕاستەوخۆ پێش لە دایکبوونی مەسیح بە چەند ساڵێك ڕۆمان دەستیان لە کاروباری ڕامیاری ئەرمینیا وەردەدا، سەرکردەی ڕۆمانی (تێبیریۆس) کە لە ساڵی ٢٠پ.ز دوورگەی (ڕۆدس)ی کردبووە بارەگای خۆی لێپرسراوی سەر ئەو ناوچە کوردی و ئەرمینیانە بوو کە تیایدا ململانێی نێوان فرس و ڕۆمان گەرم بوو بوو. تا کار گەیشتە ئەوەی شوێنکەوتەکانی ڕۆمان لە ئەرمینیا داوایان لە ئیمپراتۆرەیتی ڕۆمانی ئەکستۆس کرد ئەرداشیسی دووەمی شوێن کەوتەی فرسەکان لە سەر تەختی دەسەڵاتی ئەرمینیان دەربکات. ئیمپراتۆر سوپایەکی ڕۆمانی ناردە ئەوێ و تیکرانی سێیەمی کوڕی ئەردانستی دووەمی لە سەر تەختی

ئەو ولاتە دانا. ئەمەش تا سالی هەشتی پێش زاین فەرمانڕەوایی کرد. دوای مردنی ئەمیش ئەرمەن تیکرانی چوارەمی لە گەڵ خوشکەکەی و زاواکەی (ئیراتۆ) لە هەمان کاتدا لەسەر تەخت دانا، ئەم کارە بووە هۆی تووڕەیی ئیمپراتۆریەتی رۆما لە ئەرمەن، بۆ ئەو مەبەستەش، دەستی دایە رووژاندنی لایەنگرانی خۆی دژ بە تیکران و (ئیراتۆ) کەوا هەڵهاتبوون، لە دوایدا ئیمپۆرتۆر (کایۆس)ی کوڕەزای نارد بۆ سەرکردایەتی کردنی هەڵمەتێك بەرە و رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك و باکوور و میزۆپۆتامیا کە دووبارە بارودۆخی تێکچووبوو، و (ئەریۆ بارزان)ی کوڕی (ئەرتەبان)ی پاشای میدیا فەرمانڕەوایی دەکرد لە دوای ئەوەی کە کایۆس چاوی بە فەرهاتیسی پاشای فرسەکان کەوت هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ئەریۆ بارزان ببێتە پاشای ئەرمینیا و کوردستان.

لە دوای ئەریو بارزان ئەردانستی کوڕی بوو بە جێنیشینی باوکی کە لە فەرمانڕەوایەتی ئەو ولاتە و بەهۆی ئەو گرفتانەی لە نێوان لایەنگرانی هەردوو ئیمپراتۆریەتی فرسی و رۆمانی دووبارە ڕوویدایەوە لە ئەرمینیا تیرۆر کرا. لە لایەکی تریشەوە لە سالی ٣ی زاینی کاریۆس لە گەڵ شانشینە خۆجییەکانی باکوری میزۆپۆتامیادا رووبەروی کۆمەڵێك کێشە بوویەوە و بەهۆیەوە لەناوچوو، کاتێك هەواڵەکەش گەیشتە رۆما قەیسەر فەرمانیدا هێرش بکرێتەسەر ئەو شانیشینانە.

لە پێش زایندا بە یەك سالْ (دوای ئەوەی فەرهاتیش چاوی بە کاریوس کەوت) فرسەکان لە گەڵ رۆمەکاندا پەیماننامەیەکیان مۆرکرد بە پێی ئەو رێکەوتننامەیە دەستیان لە هەردوو هەرێمی ئەرمینیا و کوردۆئینی (کوردستان) هەڵگرت، بەلام لە سەردەمی ئەرتەبانی سێیەمی فرسدا لەسەرەتای چاخی مەسیحیدا سەرلەنوێ شەڕ لە نێوان هەردوولا دەستی پێکردەوە و لە دەستپێکی

ئەم چاخەدا پاشا بە ڕەگەز بیانیەکان فەرمانڕەوایەتی ناوچە کوردییەکانیان دەکرد، لەوانە عیبری و بۆنتی و جۆرجی و ئەرمەنی و فرسی. و لە دوای ئەوەی کۆدرز بوو بە جێنیشینی ئەرتەبانی پێنجەمی باوکی، لە فەرمانڕەوایەتیکردنی دەوڵەتی فرس لە ساڵی ٤٠ی زایندا، هەوڵیدا ئەو ناوچانە بگەڕێنێتەوە و بیخاتەپاڵ ئیمپراتۆریەتییەکەی، بەڵام سەرکردەیەکی ئەرمەنی بە ناوی میترادات توانی زاڵبێت بەسەر هەندێ لە ناوچە کوردەکانی باکووردا، ئەنجا چووە شانیشینی حەزیبەوە (ئەربیل) لەوێشەوە بەرە و ناوچەی کرماشان ڕۆشت و، توانی هەموو ئەو ناوچانە بۆ ماوەیەکی کەم بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئەرمەنییەوە. (حەدیب) شانیشینێکی بچووك بووە ئیمپراتۆریەتی فرس (٢٤٧ –٢٢٤ پ.ن) لە رامیاریە گشتییەکانیدا سەرۆکایەتی دەکرد لە گەڵ مانەوەی بە مەڵبەندێکی سەرخستنی ئاینی مەسیحی. ئەم شانیشینە ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە دەکەوێتە باکووری میزۆپۆتامیا و پایتەختەکەشی ئەربیل بووە. لە سەدەی یەکەمی زاینیدا بنەماڵەی پاشایەتی ئەم شانیشینە چوونە سەر ئاینی جولەکە و، ئەندامانی ئەم خێزانەش سەر بە هۆزە سکیسیەکانن. لە ناویاندا شاژنە دایك هیللین ناوداربوو (ساڵی ٥٠ی زاینی کوچی دوایی کردووە) ناوبانگی بە هاوکاری جولەکەو پەرستگاکانیان دەرکردووە، مۆنۆبازۆسی دووەم و ئیزاتیس (عزە) ی دووەمی کوڕی لە گۆڕستانی پاشاکانی ئۆرشەلیم نێژراون. بەڵام کە مەسیحیەت لەم ناوچەدا بڵاوبوویەوە کە لە ئارامی و عەرەبیدا (بە حزە) ناسرابوو، ئەم بنەماڵە فەرمانڕەوایە باوەڕی پێهێنا، ئەنجا شانیشینەکە بووە مەڵبەندێك بۆ بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە گشت ناوچە کوردیەکان و دەرەوەیدا.

دەسەڵات لە ناوچەکانی کوردوینیدا لە دەستی ئەرمەن گوازرایەوە بۆ پاشاکانی (حزیب) بەوەش زۆربەی ناوچە کوردییەکان یەکیان گرتەوە، ئەنجا

مۆنۆبازۆسی یەکەم فەرمانڕەوایەتی سەر ئەم وڵاتەی دایە دەستی ئیزاتیسی (عزه) کوڕی کە بە درێژایی حوکمڕانی ٣٥-٩٥ زاینی لە ناوچەکانی کوردوینی نیشتەجێ بوو.(١٥)

مۆنۆبازۆسی کوڕی پاشا ئیزاتیسی یەکەم پێش ئەوەی بچێتەسەر ئاینی جو هیللینای خوشکی خۆی مارەکردووە. لە دوای مردنی، رووبەری شانیشینەکەیان فراوانبووە و ئەرتەبانی فرسی دانیناوە بە ئیزاتیسی دووەمی کوڕیدا، نەسیبەین و دەورووبەری پێداوە لە دوای ئەوەی لە دەستی ئەرمەن دەرهێناوە وەك پاداشتێك بۆ یارمەتیدانی ئەم ئمپراتۆرە لە گەڕانەوەی بۆسەر تەختەکەی کە پێشتر لە کوردستان بۆ ماوەیەك دوورخرابووەوە. پاشای (حەدیب) هاوکاری مهرداتی کوڕی وەنوز (ئەنوش) ئەکرد، کە لای رۆمان پەروەردە ببوو هەوڵیاندا بیخەنە سەرتەختی ئیمپراتۆریەتی فرسی لە سەردەمی قەیسەر کلۆدیۆس ساڵی ٤٧ زایین لە جیاتی کۆدەرس. بۆیە بە هاوکاری رۆمان میهردات هاتە کوردستان و خەڵکەکە لایەنگریان کرد، هەروەها ئەبکارۆسی پێنجەم پاشای رەهای عەرەبی لایەنگری کرد. لەسەردەمی نیروندا هێزێکی رۆمانی هاتنە ئەم ناوچانەو بەشێکی زۆری کوردستانی باکووریان گرتە دەست، بەڵام لە کۆتایی سەدەی یەکەمی زایندا ئاشتەوایی لە نێوان فرس و رۆماندا بۆ ماوەی نیوە سەدەیەك بەردەوامبوو، کە تیایدا ئاسایش و ئاشتی باڵی کێشابوو بەسەر ناوچە کوردیەکاندا، بەڵام دوای ئەم ماوەیە مەترسییەکە لەو ناوچە باکووریانەوە هات کە بە رێڕەوە خەزەریەکانی وڵاتی قەوقاز دەناسرێت، ئەوەش لەوکاتەی هۆزە لانییەکان (ئالانییەکان) هەوڵیاندا لەوێوە بەرە و ئەرمینیا بپەڕنەوە. ئەم هۆزە دەشتەکییانە لە نێوان ناوچە باشوریەکانی رووسیا لە رۆژئاوا و ناوەڕاستی کشوەری ئاسیا لە رۆژهەلاتدا کۆچەر بوون. مێژوونووسی یۆنانی مەرکلینیۆس (٣٣٠-٤٠٠ زاین) وەك نەتەوەیەك وەسفیان دەکات کە نە کشتوکاڵ و نە

کۆیلایەتی ئەزانن و، لەو گالیسکانەدا دەژین کە ئەسپ رایدەکێشێ و پێی دەناسرێنەوە، لەشارەکاندا نیشتەجێ نەبوون و پەرستگایان نەبوو، ئەوان لای چینیەکان لە سەردەمی دووەمی زاینی ناسراوبوونە، کە چوونەتە ئەو دەشتانەی دەوروبەری دەریای قەزوین و باشووری چیاکانی ئۆرالّ، ئەوەش ئەو ناوچەیە کە هۆزەکانی سەرماتی لێبووە و لە سەرەتاکانی سەدەی زایندا بە ئالان و ئالاس ناسرابوون. بەشێك لەمانە هەولّیانداوە لەو رێڕەوە بپەڕنەوە کە دەکەوێتە رۆژئاوای دەریای قەزوینەوە و بە رێڕەوی خەزەر ناسراوە و، بەرە و شاری دەربەند (دەرگا) خواربوونەوە و ئاراستەی جولاّنەوەیان لە مێژوودا بە (دەریال = دەری+ئال) ناسراوە، واتا دەرگای ئال.

لای جۆرجیەکان ئەمان بە (ئۆسیتی OWS-ETTI) ناسراون ئێستا نەوەکانیان لە رووسیا بە (ئۆسیتین OSSETIN) دەناسرێن، ئەم شێوەیەش لە (ئۆسیسی OWSETHI) یەوە پەرەی سەندووە، واتا سیس یان لە کۆندا سکیس.

ئەرمینیا و کوردستان و میدیای بچووك و ئازەربایجان کەوتەبەر هێرشی لانەکان و جۆرجیەکان و ئەم ولاّتە تووشی زۆر لە کارەسات و تالاّنکاری و کاولکاری هاتن. ئمپراتۆرەیتی فرسیش نەیتوانی بەرگری لەم ناوچانە بکات، لە لایەکی تریشەوە ئەم ناوچانە کەوتنە بەر هەڕەشەی رۆمان. لە سالّی ١٠٠ی زاین ئیمپراتۆر ترایان (تراجات) سوپایەکی ناردەسەر ئەرمینیا و میتراداتی پاشای لە ناوبرد، ئەنجا لە سالّی ١١٥ زایینی لە رێگەی سوریاوە خودی ئەم ئیمپراتۆرە هەلّمەتێکی سەربازی کردە سەر ناوچە کوردیەکان و دەستی گرتە سەر زۆربەی ناوچەکانی باکووری رۆژئاوایدا. ئەنجا لە دوای داگیرکردنی حەزەر دایەسەر ئەدیابینی (حەدیب)دا رووی کردە بابل. ئەم هەلّمەتانە لە دوای ئەوە ڕوویدا کە فرسەکان ناوچە کوردیەکان و ناوچە ئەرمەنیەکانیان بەزاند و شانیشینە خۆجێیەتیەکانیان لەناودا. هێزە فرسیەکان لە سالّی ٥٢ی زاین چوونەشاری

تیکرانۆکرتا (میافارقین)ەوە کە پایتەختی شانیشینی (ئەرتاکساتا) بوو، یەکێك لە بنەماڵەی شایانە هەڵهات و پەنای بردە لای ئەو ئەرمەنانەی ناوبانگیان گەیشتبووە رۆمان.(١٦)

لە لایەکی تریشەوە وولاش (بلاش) ی ئیمپراتۆری فرس هەموو ئەو کارومافانەی ئەرتەبانی پێنجەم دابوویە ئیزاتیسی دووەمی پاشای (حەدیب) و فەرمانڕەواکانی دیکەی کوردستان لێی سەندنەوە. لەبەر ئەوە ئیزاتیس بریاریدا پێگەی سەربازی خۆی پتەوبکا و دانەوێڵە پاشەکەوت بکا و سوپاکەی رێکبخاتەوە و قەڵاکانیشی نۆژەن بکاتەوە، خۆی و شەش هەزار سوار چوونە ئەو ناوچە شاخاوییانەی دەڕواننە سەر زێی گەورە، کە ئەوکات هاسنووری ئازەربایجان و میدیا بوو، لە دوای هەڕەشەو گوڕەشەی پاشای فرسەکان لەو ناوچانەپاشەکشەی کرد و رووی کردە باختریا (ئەفغانستان)، رۆمانەکانیش لەسەردەمی ئیمپراتۆر نیرۆندا خۆیان ئامادە کردبوو بەرە و رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك لەشکرکێشی بکەن، بریاری لەشکرکێشیەکەیاندا بە ئەنتیخۆسی چوارەمی پاشای هوماجینی و ئەکربیادۆم (AGOIPPAII)ی سەرکردەی خەلقیس بۆ ئەنجامندانی ئەو بڕیارە، لە دوای پەڕینەوەیان لە رووباری فورات بەرێوەبردنی ئەو ناوچە کوردیانەی بەشێك بوون لە شانشینی ئەرمەنی بە ئەریستیۆ یۆلۆسی کوڕی هیرۆدی پاشای کالسیس سپێرا. و لە ساڵی ٥٩ی زاین سەرکردەی رۆمانی (کۆرپۆلۆ) چووە ناوچەکانی شاری ماردین و لەوێشەوە رووی کردە میافارقین، لەم هەڵمەتانەیدا گرفت و گرانییەکی زۆری هاتە پێش و زستانی لەو ناوچانە بەسەر برد، لە دوای پەڕینەوەیان لە رووباری فورات نزیك بە شاری مەلاتێی کوردی نێردراوەکانی هەرکانیای پێگەیشتن. و لە دوای ئەوەی رۆمانەکان توانیان بە بڕیاری قەیسەر نیرۆن کەسێك بە ناوی تیکرانی پێنجەمەوە بە پاشای ئەرمینیا

دابنێنن و هەندێ لە هەرێمەکانی دابڕن و بیخەنە سەر جۆرجیا و بونتس، تیکران هێرشی کردە سەر شانشینی (حەدیب) و ناوچە کوردیەکانی باشوور و بە تەواوەتی وێرانی کرد. بۆیە مۆنۆبازۆسی پاشای (حزیب) جگە لە ملکەچی بۆ رۆمان هیچی تری بە دەستەوە نەمابوو، بەلآم ئیمپراتۆری فرس فەرمانیدا بە مۆناسیس کە یەکێك بووە لە سەرکردە سەبازیەکانی کەوا بەیارمەتی مۆنۆبازۆس هێرش بکاتەسەر ئەرمینیا. لە دوای ئامادەکردنی ئەم هاوپەیمانییە شەڕ لە گەڵ ئەرمەندا دەستی پێکرد، ئەنجا رۆمانەکان بەسەرکردایەتی (کۆرپۆلۆ) لە نزیك نەسیبەین هاتنە شەڕەکەوە و لە دوای هاتنەدی ئاشتی و سوپای هاوبەشی فرسی و حودەیبی ئابلوقەی سەر شاری (میافارقین)نیان شکاند و، ناوچە کوردیەکانی باکوور، بە تایبەتی مەلاتیێ و میافارقین و دیاربەکر و جگە لەمانەش لە ژێر دەسەلآتی رۆمانیدا مانەوە. پاشا مۆنۆبازۆس شایەتی مۆرکردنی ئەو ئاشتەوایە بوو کە لە سنووری دەسەلآتی هەردوو ئیمپراتۆریەتی لە ناوچە ئەرمەنی و کوردیەکاندا دیاریکرد.

بە هەرحاڵ لە سەدەی یەکەمی زاینیدا چەندینجار شەڕ لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتیەکەدا روویداوە، هەرچۆنێك بێت شانشینی هەولێر دۆستایەتی خۆی لە گەلج فرسدا پارست، بۆیە فەیروس لەسەرتای دووەمی زاینیدا فەرمانڕەوایەتی ناوچەکانی جەزیرە (ئۆسروینی)دا ئەبکارۆسی حەوتەمی کوڕی ئیزاتیس (عزە)، بەرامبەر بەو باجییانەی تیایدجا بۆ دەکرێتەوە بۆ دەوڵەتی فرسدا. ئەمەش لەو کاتانەدا بوو کە ئیمپراتۆر ترایان، بەرە و رۆژهەلآت دەچوو و دواتریش چوو ناو ئەدیسا (ئۆرفە)ەوە ئەنجا گەڕایەوە بۆ ئەنتاکیا و لەوێ ئەبکارۆسی حەوتەمی پێ گەیشت و لە گەڵ خۆیدا دیلارییەکی زۆری بۆ هێنابوو بۆ ئەوەی لە شانشینەکەیدا سیاسەتی خۆی لە نیچوان فرس و رۆماندا هەموار بکاتەوە. کاتێك

